الى من يهمه الأمر

لا مانع لدي من ان ينشر السيد محمد عبد الرحمن
زنكنه لمسرحية (الأغراب) صورة الشهيد
المنشورة بالعدد الاول من مجلة (الزراد[illegible])
مع التقدير

فائق حسن

[illegible]

٢٥/١٢/٩٦٨

بەو کرێکارانەی وا گیانی پاکیان لە پێناوی
مافیاندا بە خاك سپارد .

بەو نووسەر و ئەدیبانەی کە هەمیشە نووکی
تیژی قەڵەمەکانیان وەکو چەقۆ بە چاوی ئیمپریالیزم
و کۆنەپەرست و دەرەبەگدا چەقیوە .

بەو جەماوەرەی کە هەمیشە لە کاتی لێقەوماندا
یاریدەدەری چینی کرێکار بووە .

# پەردەی یەکەم

[ هاوینێکی زۆر گەرم ، کەپرێکی گەورە وچەن شتێکی تێدایە لە سوچێکی کەپرەکەوە دانراوە ، تەناقێک لە ناوەڕاستی کەپرەکەیەو جل و بەرگی رەنگاو رەنگی پێدا هەڵواسراوە چەن بەرمیلێک لەو ناوەدایە نەپاکەو نەپیسە مام ناوەندییە ] .

حەمەشین ـ ئای چەن جوانە ( ئەڕوا بۆلای جێشتانەکە ) سوێر بێت باشترە بەڵام ئەم خوێیە تاڵی تێدایە چونکە ئەمڕۆ کارگەکانیش فێری هەزار فێڵ بوون .... ئای بۆ خوێیەکەی جاران ( سەیری کاتژمێرەکەی ئەکا ) . کاتمان بەسەرچوو ئەوە نیوەڕۆیە کاتی پشوودانە چی ڕزگارمان ئەکا لێیان من ناتوانم ڕوخساریان ببینم ... دەستیان بە ڕۆن وگرێسەوەیە . ئەخیەنێ ناو جێشتەکە پاشان بە هەزار دەردە سەری ئەو قاپانە ئەشۆم ( مەریوان دێتە ژوورەوە ) .

مەریوان ـ دەمم ووشک بوو تف لە دەمما نەما .

حەمەشین ـ مەریوان دەستت لە کوپەکە دەرکە .

مەریوان ـ تینوومە ئاو ئەخۆمەوە .

حەمەشین ـ دەبڕۆ لە بەرمیلەکان ئاو بخۆرەوە لە کوپەکە گەڕێ .

مەریوان ـ بەڵام مامە حەمە زۆرم تینوە .

حەمەشین ـ قەی ناکا بڕۆ لە بەرمیلەکە ئاو بخۆرەوە .

مەریوان ـ ئاوی بەرمیلەکان وەک ئاوی دۆزەخ وایە زۆر گەرمە.

حەمەشێن- کورە جامەکە دانە هەمووی چەور بوو لەم لاوە ئەیشۆم
لەولاوە پیسی ئەکەن هەی گوێرەکە .
مەریوان- ئەگەر ئەزانی بەدەس جامەکە پیس ئەبێ ئەوا خۆت ئاو
بکە بە دەمەوە بۆ ئەوەی جامەکە پیس نەبێ .
حەمەشێن- چی ئەڵێی ... بە هەموو هۆش و بیرتەوە ئەڵێی
ئاو بکە بە دەمەوە بەخوا جوانە لەمەودوا ئاویشی بکەمە
دەمتانەوە .
مەریوان- ئارەزووی خۆتە مامەگیان .
حەمەشێن- کورە مەریوان سەرت لە بەرمیلەکە دەرکە ئەڵێی مانگایت
گوێت لێ ی نیە ؟ .
مەریوان- زۆر گەرمە جگەرم سووتاوە .
حەمەشێن- ئەم جۆرە ئاو خواردنەوە ئاو خواردنەوەی وولاخە .
مەریوان- ئەمەوێ ئاو بخۆمەوە ئەمەوێ تینێتیم بشکێنم
فورمە نەکەم هاوارم بەسەرا ئەکا لەوانەیە مەکینەکە
بسووتێ .
حەمەشێن- کورە بەسە ئیتر ئاو مەخۆرەوە .
مەریوان- ئەڵێی جام؟ کوا جام ؟ .
حەمەشێن- کورە جامی چی ... دەبرۆ باش تۆزێکی لە دەسکێش
بەرئەدەن. وەرە ئاو بخۆرەوە .
مەریوان- من تینوومە ئاو لە لەشما نەماوە وا دڵم ئەتەقێ .
حەمەشێن- خوا ئەکا دڵت ئەتەقێ ... لەکوێڵان ئەبێتەوە بۆ

خۆت ڕا ئەگری وەکوو حوشتر ڕاوەستاوی پاش تۆزێکی کە دەکی بەرئەدەن وەرە ئاو بخۆرەوە ئەگینا خۆرمەن بانگ ئەکەم ... ئا ... ئەوە خۆرمەنە .

خۆرمەن ـ بۆ ئێشەکەت بەجێ هێشتوە هاتووی بۆ ئێرە چیت ئەوێ؟

مەریوان ـ هیچم ناوێ گەورەم ئەمەوێ ئاو بخۆمەوە .

خۆرمەن ـ بۆ ئاو لە تەنەکەکەی تەنیشت مەکینەکەوە نیە ؟

مەریوان ـ گەورەم تەنەکەکە ئاوەکەی ڕژا ( ئەڕوا ) .

حەمەشین ـ وازی لێ بێنە ... خۆرمەن شتێکت ئەوێ من لە خزمەتام فەرموو دانیشە ... ئەمڕۆ زۆر گەرمە ئەڵێی دۆزەخە چۆن هاوینێکە ...؟ ئاوت ئەوێ فەرموو جەنابی خۆرمەن دڵت فێنک بکەرەوە ئاوی کوویەکە وەکوو ئاوی سەهۆڵ وایە .

خۆرمەن ـ بەڵام دەسم پیسە .

حەمەشین ـ بخۆرەوە خۆرمەن گیان دوایی خۆم ئەیشۆم لە جامەکە ئەترسی ...؟ تاکو خۆم لێرە بم بۆ هەموو شتێک ئامادەم هەزار جار جامت بۆ ئەشۆم ... بخۆرەوە گەورەم .

خۆرمەن ـ ڕاستە ئەمڕۆ دونیا وەک دۆزەخ وایە .

حەمەشین ـ جا گەورەم پێویست بەوە ناکا لەبەر هەتاوەکە ڕاوەستی وەرە ئێرە بۆ خۆت پشوویەک بدە بۆ کێ ئەوەندە خۆت ماندوو ئەکەی .؟

خۆرمەن ـ پێویستە ڕاوەستم بەسەر ئێشەکەوە چاوە دێری

بکەم چاوم لە هەڵکەندنی بیرەکان بێ ... ئاگاداری

بێکەینیەکەی بارامی نازدار بەم گوتم لە چیە چیەکانی بێ،

کاتێ قسەئەکا لەگەڵ ئەو کرێکارانە . ئەم پیاوە بە

ئاسوودەیی دانانیشێ ... ئەگەر (٢٤) سەعات بە

سەریانەوە نەوەستم هیچ ئیش ناکەن ئەو کاتەتە لە یاد

چوو کە نەخۆش کەوتم بەچی جۆر بیرەکەیان هەڵکەند.؟

حەمەشین - ئەوانە کێن بە پەنجەیەک هەموویان ڕائەستێ

ئەکەیتەوە ولە ناویان ئەبەیت .

خۆرمەن - تەماشاکە حەمەگیان .

حەمەشین - بەڵێ خۆرمەن .

خۆرمەن - ئەمەوێ زۆر بە باشی چاودێری بارام بکەی .

حەمەشین - لە خواردنا .

خۆرمەن - خواردنی چی ... کاتێ قسە ئەکا چی لێرە یان لەسەر ئیشەکە .

حەمەشین - چی ئەکا !!

خۆرمەن - حەمە خۆت گێل ئەکەی ... پاش دەس بەردانیان لە ئیشەکە

... بزانە چی ئەڵێ لەگەڵ کرێکارەکانا .

حەمەشین - ئا ئێستا تێ گەیشتم وەکوو جاران گوێ هەڵئەخەم ... بزانم

چی ئەڵێن بە تۆ و خاوەن ئیش بڵێم .

خۆرمەن - تو خودا تەماشاکەن .. ئەڵێن کا لە حەمە زۆر زانەیە..

لەمە زۆر زاناتر بوون ئەبێ .

حەمەشین - ئەی ئەم مێشکە چیە ... مێشکی دانایە .

خورمەن - مێشکت بە تایبەتی بۆ بادام بەکار بێنە .

حەسەنی - بادام ... من بۆ بادام .

خورمەن - بەڵێ بۆ بادام ... ئەگەر ئێوە بادامە لێرە نەمێنێ من بۆ خۆم ئەگەڕێمەوە ئیسرائیلەوە ... ئەترسم ئەوەکانی کەس فێر کا مێشکیان پڕکا ئەگەر بێتو مێشکیان تێک بدا دژم ڕائەوەستن با لە نێوان خۆمانا بێت ئەم جۆرە کرێکارە تەکنیکیانە ئازان وەکوو ئەوان هیچ دەس ناکەون ... ئەگەر دەریان بکەم خاوەن ئیشەکە شێتە ئەبێ ... ئەگەر ئەوان دەرکران ئێمەیش دەرئەکرێین .

حەسەنی - بەم جۆرە !.

خورمەن - بەڵێ ... بەم جۆرە ئاگادار بە نەنوێت چاوکرەوە بە (ئەبەدی بڕوا)

حەسەنی - بۆ کوێ دانیشە بەم گەرمایە ... جگارە یەکی قلتەر بکێشە فەرموو گرتیقن .

خورمەن - ئەگەر بەسەریانەوە نەوەستم ئیش ناکەن .

حەسەنی - خورمەن ئەمە ئاوازێکی تازەیە ... لێیان گەڕێ ... بۆ خۆت بەوانەوە ماندوو ئەکەی ؟

خورمەن - خاوەن ئیش جاری پێشوو گلەیی لێ کردم لە بیرەکەی بابا وەیس . ئەزانی بۆ ؟ .

حەسەنی - بۆ ؟ ! .

خورمەن - چونکە ئیشەکەی درێژەی کێشا و درەنگ تەواو بوو .

حەسەنی - بەخوا من ئەزانم لە سەرەتادا و لیشتوویانەتە سەر تۆ .

فۆرمەن - بەسەرمن بۆ ..؟. خۆلەئێش وکاری خۆم باش نەبووم

...؟ ئافەرین بۆتۆ حەمەگیان ... بارامت لەیاد چوو ؟.

حەمەشین - نا بەخوا لەیادم نەچووە سەری گلۆڵەکە ئەوە .

فۆرمەن - ئافەرین حەمەگیان من لەلای خاوەن ئێش لەمود شتێکم ...

ئەگەر بڵێم بمرە ئەمرێ ... بڕێ ئەڕێ ... حەمەگیان بۆنازانی

ئەم کرێکارانە چین ... ئەتەکێت نازانن . بەڵام بارام

فێری هەزار شتیان ئەکا .

حەمەشین - ڕاستە ئەمەی بەخوا ڕاستە ئەگەر تۆ نەبی ئەمانە پیاو ئەخۆن

یاخوا دری تۆ هەر لەسەر پشتیان بێ .. ئێستاکە لە کوێ

جاران لەکوێ ! . ئەو کاتەت لەیادە کە لە کومپانیای

(K3) ی بووین ئاخ وداخ بۆ ئەو بنێگانانە چەن دڵ

نەرم بوون و لەئێستا چەن ڕەشە بوون ... من پاشا بووم پاشا

... چێشتی ئینگلیزیم لێ ئەنا .

فۆرمەن - بە سیەلی سەیچەرە وە یادم ... ئای کە ئەو ڕۆژانە چەند

خۆش بوو .

حەمەشین - چێشتخانەکە لەجوانی یا دێنەی نەبوو کاتێ مێزەکانم -

ئەڕازانەوە ئەوەی کە لەسەری دائەنیشت خۆی لێ ئەبووبە

پاشا . کاتێ خواردنیان ئەویست ئەیانووت (پلیس مای دینەر)

... بەم جۆرە نازە قسەیان لەگەڵما ئەکرد بەڵام ئێستا

دەیهیان بەڕۆن وگریسەوە بەبێ ئەوەی بیشۆن ئاو -

ئەخۆنەوە ... نان ئەخۆن . ئەو خواردنە کە ئەیخۆن بە

ـیەکجاری پیس ئەبێ .

خۆرەمان ـ حەمە گیان ـ

حەمەشین ـ بەڵێ گەورەم .

خۆرەمان ـ تۆ چێشتت کە ئێکی ڕاست نەبوی .

حەمەشین ـ بەڵام خۆرەمان .. من تۆ ...

خۆرەمان ـ بەسەیەتی .

حەمەشین ـ بەڵام خۆرەمان ...

خۆرەمان ـ بەسەیەتی ئەمڕۆ چێشت لێ ناوە .

حەمەشین ـ چێشتی کوولەکە بە نۆکەوە بۆ کرێکارەکان ... بەڵام ئێوەکەی
خۆت خواردنێکی (سپیشەڵی) بۆ داناوی ... واتە تایبەتی
ئەزانی چی ؟ .. قوتوویەکی گۆشتی بیف و قاپێ زەلاتەی جوان .

خۆرەمان ـ چی کە ؟ .

حەمەشین ـ چی کە (لەگەڵ زەردەخەنەیەکا) بەخوا تەنها چارەکێکی ماوە .

خۆرەمان ـ بەخوا درۆ ئەکەی ... ئەی کوا نیو چارەکەکەی کە دەری
کە (ئەیەوێ لێی بدا) .

حەمەشین ـ باشە ... باشە لێم مەدە ئەوە ئەیهێنم با کرێکارەکان نەی
بینن ... ئەگینا بە خاوەن ئیشەکە ئەڵێن .

خۆرەمان ـ دەی ئاگا لە من نەترساوم و ناترسم .

حەمەشین ـ ئا ... زوو بۆ خۆت (مەهدی دێتە ژوورەوە) .

مەهدی ـ مامە حەمە ئەوە نانەکەیە .

حەمەشین ـ بیخەرە سەر بەرمیلەکە (تەماشای نانەکە ئەکا) ـ

ـ گوڕێ لەتیو ئەمە چیە ؟ .

مەهدی ـ بابە حەمە گوایە من تا ئەوام چی بکەم کاتم نەما لەمرود
سمێلم سووتاوی تەنوورەکەیە .

حەمەشێن ـ ئەمەیە چارەنووست ... دەی بڕۆ ئەم چێشتە و پێنج
نان بەرە بۆ کەمپی دووەم ... ئەمڕۆ تۆ بیبە .

مەهدی ـ دوێنێ من بردم ئەمڕۆ نۆرەی تۆیە .

حەمەشێن ـ ئەگەر بە ئوتۆمۆبێلەکە بچێ ئەیڕۆم .

فۆرمەن ـ دەی خۆت بیبە تا زووە ئوتۆمۆبێلەکە ناڕوا
گەرمە ئەیکوڵێنێ .

حەمەشێن ـ دەی مەهدی بیبە .

مەهدی ـ وەستاگیان دونیا گەرمە وەک دۆزەخ وایە ...
ڕێگاکەیشی یەک کات زیترە ئەمڕۆ زۆریش نەخۆشم .

فۆرمەن ـ توانای ئیشت نی یە ؟! .

مەهدی ـ نا گەورەم نەخۆشم و ڕێگاکەیشی زۆر دوورە .

فۆرمەن ـ چاک بزانە ... ئەگەر توانای ئیشت نیە ڕاستە بڕۆ بۆ ماڵی
خۆتان ... کرێکار زۆرە و دەستیش هاچ ئەکەن تەنیا یەک
پەنجە درێژ کەم هەزاران کرێکار ڕووسان تێ ئەکا بۆ ئیش ...
بەڵام بۆ خۆم ئووشی سەرێشە بکەم تۆ دانیشە ...
حەمەگیان خۆت بیبە .

حەمەشێن ـ بەڵام فۆرمەن ... منیش نەخۆشم .

فۆرمەن ـ پێت ئەڵێم بیبە .

مەلەک - قەی ناکا وەرشا گیان خۆم ئەیبەم.

خۆرمەن - دیتت بارم چۆن مێشکیانی پڕ کردووە فێری هەموو
شتێکی کردوون.

مەلەک - مامە گیان خواردنەکەم بەرێ با بیبەم؟

حەمەشین - ئەوە تا زوو برۆ مەوەستە.

مەلەک - ئەم مەنجەڵە زۆر گەرمە ئەلێی ئاگرە ... نانەکەیشی
کەمە بەشیان ناکا.

خۆرمەن - بەسیانە ... خۆیان پێنج کەسن .. نانەکەیشی پێنجە
لێ بگرە و بەردە خێرا خۆت برۆ.

مەلەک - ڕاستە گەورەم با زوو برۆم برسیانە (دەڕوا).

خۆرمەن - برسییانە ... برسی خوا ئەکا لە برسانا ئەمرن ... چاوت لێیە
چۆن بە تەنگیانەوەیە ئەم وشانە هەموو وشەی بارمە.

حەمەشین - بەخوا کە پێت وتم برۆ بە تەواوی خوێنم تیا نەما.

خۆرمەن - حەمە گیان ناچار بووم.

حەمەشین - من گیانێکم هەیە هەموویانی ئەهێنێ ... ئەوانە کێن ...
وەکوو کرمن.

خۆرمەن - بە سیەتی دەهێت بدوورە. (مەلەک دێتە ژوورەوە). بۆچی
گەڕایتەوە ... ئەی خواردنەکە کوانێ؟

مەلەک - لە ڕێگا هاتەوە یادم کە ئاوم بۆ نەبردوون.

حەمەشین - ئەی لەوێ ئاوی ئاو هەیە... ئەم لاو ئەولایان
هەموو ئاوە.

مەهدی - ئەی ئێوە نازانن ئاوەکەی گەرم و سوێرە، ناخورێتەوە،
حەمەشین - کوڕە ئاوی ئەم ناوە هەمووی وایە.
مەهدی - بەڵام ئاوەکەی ئێمە باشترە ... گوناهن -
فۆرمەن - بێدەنگ بە، تەنەکەیەک ئاو بەرە و بڕۆ ... بۆ وەستاوی ...؟
مەهدی - وەستاگیان بۆ بە تۆتۆمۆبێلەکە نەبێ.
فۆرمەن - کوڕە هەتیو چەندە چەنە بازی،
مەهدی - بەڵێ گەورەم (دەر ئەچێ).
فۆرمەن - بەخوا ئەم سەپیونانەش فێری ئۆتۆمۆبێل بوون ... ئەم مشکە کوێرانە بە شەق نەبێ ئیش ناکەن بە دەس من بێ هەموو ئەم کرێکارانە لەناو بەرم و ئارەزوو ئەکەم خوێنیان بمژم ... چونکە خەریکی مان گرتنن
حەمەشین - ئاخر ئەمانە کە مان ئەگرن داوای مافی خۆیان ئەکەن.
فۆرمەن - چەن جار پێتم ووت دەمت بدوورەوە قسە مەکە.
حەمەشین - بەڵێ فۆرمەن.
فۆرمەن - ئەم کرێکارانە با بتۆپن ... خێرا لە خواردنەکەم بۆ ئامادەکە.
حەمەشین - بزانە چۆنم بۆ دروست کردووی بەچەکانی پێوە ئەخۆی (بارام دێتە ژوورەوە).
بارام - من زانیم.
فۆرمەن - چیت زانی.
بارام - (قوڕەکەی پیشان ئەدا) ئەو بەشەی کەلەگەڵ پشتێن

- قوڕو لماوە چینێکی کەشی هەروا ئەبێ . تۆ تەماشای ئەم
قوڕە بکە .

فۆرمەن - (بە تووڕەییەوە) چییەتی .

بارام - قوڕو لماوە .

فۆرمەن - بەسیەتی ئیتر هەڵمەکەن .

بارام - چۆن بەسیەتی !.

فۆرمەن - ئەمە ئەو چینەیە کە ئەگەیەتە نەوت .

بارام - فۆرمەن بە بڕوای خۆت ئەم ئاوەی کە ئێستا دەرچووە
لە بیرەکە زۆر کەمە ئەگەر بێتو بۆرییەکی دوو ئینچی
بخەینە سەر هەموو ئاوەکە هەڵ ئەمژێ . پاشان دەس
ئەکەینە هەڵکەندن بۆ سەبەی هیوای دیار بوونی
نەوت ئەکەم .

فۆرمەن - ئەتەوێ فێرم کەی ... ئەتەوێ چینەکانی زەویم
فێر کەی کام چین ئاوی تێدایە و کام چین ئاوی تێدا نییە .

بارام - نا ... نا بەڵام ...

فۆرمەن - بەڵام چی ... وازمان لێ نا هێشتی تۆیش بوویتە بەشت
بە بەرمانەوە بە خۆ جوانە بەڵام ئەو ساڵانەی کە ئیشم ئەکرد
هەموو خاوەن ئیشەکان دانیان بە باشەی ئیشی منا ئەنا ،
ئەمڕۆ لای تۆ هەمووی بە فیڕۆ ڕۆیشتێ ئێستا پیشی
جەنابت تێم ئەگەیەنی ... زۆر باشە .

بارام - ئارەزووی خۆتە .

خۆرمەن ـ بێ گومان ئارەزووی خۆمە .

بارام ـ بەڵام من ئەڵێم ئەم چینە خۆی نیە ... ئاولە چینەکانی
کەدایە پاشان ئەگەینە نەوت .

خۆرمەن ـ ئەم قسە بووچانە لە کام شێتێ فێر بووی .

بارام ـ ئەم قسانە لە کتێبەوە فێر بووم ئەم باسە مشت ومڕی لێ
نادێ ... بەڵام با هەڵی کەنین دوایی ئەگەین بە ئاسانی ؟

خۆرمەن ـ ئەی پرسینەوە لە سەر کێیە .. ؟

بارام ـ پرسینەوەی چی .. !

خۆرمەن ـ پرسینەوەی کات ... ئەو شتانەی کە روو ئەدا لە کاتی
هەڵکەندنی بیرەکە بڕووخێ بە سەر ئاو بە سەر مەکینەکەدا .

بارام ـ من وەک بیرهەڵکەنێک ئەڵێم ئەمە چینی ئاو نیە لەو باوەڕە
دام (٢٠) تا (٢١) مەتری ماڵێ بۆ ئاو ئینجا نەوت .

خۆرمەن ـ دەبڕۆ دەهێنا پشوونانەکەت بخۆ کاتی پشوودانە ئەوەک
کاتی بەر لە هەڵستی کردن .

بارام ـ زۆر سەیرە (دەڕێتە چێ بۆ ئەوەی دەستی بشوا) .

خۆرمەن ـ هەمە بینیت لێتێب ئەخوێنی ... من بۆ تۆ بارام . هەمە
خواردنەکەی بۆ تێکە .

هەمەشێن ـ قەینیا کە تۆ خۆت هێنێ کەوە دوایی خۆمان ئەزانین چی
لێ ئەکەین .

بارام ـ (دێتە ژوورەوە) من هیوادارم کە ئەم بیرە هەڵکەنین
وەکوو ئەوەی پێشوو ... دوو رۆژی لە ئەگەینە نەوت .

خورەمن - (بە تووڕەییەوە) ئەمڕۆ هەڵکەوتن بەسە .. بیرەکە پاڵی
کە نەون .. بەیانی زوو بۆڕییەکانی لێ ئاخنن .
بارام - بەم جۆرەیە ئەمڕۆ ئیش و کارمان بۆیە بە فیڕۆ ئەڕوا .
حەمەشین - بابە تۆ هەقت چییە .. ئایا تۆ لە خورەمن باشتر ئەزانی
.. ئەری بە خوا بەکاڵ ئەحمەدی شێخ ، بێگانەیەک نەما
ئەندازیارێک نەما شایەتی بەسەردا نەدا ( بۆ خورەمن پەیجە
ڕا ئەکێشێ ) زۆر جار بێگانەکان ئیشەکەیان لێ تێک ئەچوو
ئەهاتن ئەمیان ئەبرد ناویان نابوو خاوەنی دوو مێشک
بەفیڕۆکە لەم وڵاتەوە بۆ ئەو وڵات ئەیان برد .
بارام - درۆزن ئاگر بە ربوو لە ماڵی کەس باوەڕی پێ نەکرد
( ڕوو ئەکاتە دانیشتوانی هۆڵ ) .
حەمەشین (بە پێکەنینەوە) ها ... نانەکەت بخۆ ، دە بخۆ .
خورەمن - بارام بۆ وا بە تووڕەییەوە تەماشام ئەکەی ؟
بارام - گوایە تەماشا کردنت قەدەغەیە خۆ تەماشای زەوی
ناکەم (مەریوان و کاوە و سمکۆ دێنە ژوورەوە) .
مەریوان - حەمەشین ئاوەکە لە کوێیە دڵم لە گەرما تەقی .
حەمەشین - دوور کەوەرەوە جامەکە پیس مەکە .
بارام - با ئاو بخواتەوە لێی گەڕێ تۆزێک دڵ نەرم بە .
حەمەشین - بمبوورە وام زانی دەستی نەشۆردووە .
مەریوان - (پاش خواردنەوەی ئاوەکە) ئاه ... ڕۆژ چەند گەرمە .
سمکۆ - دونیا چەندە گەرمە وای لێ هاتووە تەنانەت کە

ـ مەکینەی دیزڵەکە نایکوژێنێ ... ئێستا لەگەڵدا ئەیکوژێنێ.

کاوە ـ مامە حەمە کوا خواردنەکە .؟

حەمەشین ـ ئەوا هات .

کاوە ـ بارام لێگەڕێ مەدەرەوە وا نانەکە هات .

بارام ـ دڵم نایا .

کاوە ـ گوێ ی مەدەرێ خۆی چاک ئەبێ ماسی لە سەرەوە بۆگەن ئەکا ناگەلێ .

بارام ـ بەڵێ تۆ ڕاستە ئەڵەی بەڵام من ئەترسم لای هەڵکەندنی بیرەکەیە .

کاوە ـ ووتمان گوێ ی مەدەرێ ... بە پای لە سەرخۆمان ئێک و چینەی لائەبەین ئەگەینە ئەو چینەی کە ئاوی تێدایە .

فۆرمەن ـ تۆیشی وەستا کاوە بووی بە سەرمانەوە بە چیلوچی ئەمانزانی ؟

کاوە ـ قوربان .. بیرهەڵکەن بۆی خاک بکا ئەزانێ چییە و چی نییە وەکوو ووتراوە نان بۆ نانەوا گۆشت بۆ قەساب ...
دوایی کاکی خۆم بارام هەقیەتی ئەمە سێ جارە کە ئەیگوتین هیچ سوودی نییە مەکینەکە لە ناو قوڕاوەکەدا ئەسووڕێتەوە ... مەبەستی ئاوەکەیە بخۆ وەستا بارام بخۆ ... گوێ ی مەدەرێ هەموو دوو ڕۆژی کە ئەبا و ئەگەینە نەوت .

فۆرمەن ـ ئەمە کاری منە .. ئەگەر دوو ڕۆژ بیا یا دە ڕۆژ ، گوێ بگرە کاوە ئێوە ئێشتان هەڵکەندنە و هیچی کە .

کاوە ـ خێرە پێش هاتنی من شتێک ڕووی داوە .

حەمەشین ـ ( خواردنەکە ئەهێنێ ) بخۆن ... بخۆن کاتی مشتەو

- مڕ نیە .

سمکۆ - ئەمە چیە ؟.

حەمەشێن - چی یە ؟ ! .

سمکۆ - دیسانەوە بەزمەکەیە .. هەرنۆکاوەکەیە ؟ .

بارام - براگیان ئەوت بیستوە تا فەرزوەستا بێ سونەت بەتاڵە .

سمکۆ - کاکەگیان فەرزی چی سونەتی چی .. هەموو ڕۆژێک ئەم
بەزمەیە ئەڕۆین هەرنۆکە دێنن بۆیێژە هەرنۆکە
سەیری چی ئەکەین . وەک نۆک دیارە .. یاخوا نۆک
لەدونیادا نەمێنێ .

کاوە - دەبخۆ ... بخۆ گوێی مەدەرێ وادیارە ئەچین
بۆ شەڕە نۆک .

فورمان - تەماشای ڕەوشتیان ئەکەی چۆن چۆنیە ! .

کاوە - کوڕە هەی بێ قەزابێ نۆک لە سکمانا ڕووا .

حەمەشێن - ئەی چیتان بۆلێ بنێم .

سمکۆ - سکمان ئاوسا لەنۆک خواردن ... ڕۆژێک نەهاتین هەڵاڕوو
بۆنی شتێکی کە بەسەرمانا بێ لەنۆک زیاتر . چەن خۆشە
ڕۆژێک لەڕۆژان سەری مەنجەڵەکە لابدەیەوە تۆزێک
گۆشت ونەماتەی تێدابێ .

حەمەشێن - کوڕە تەماتە کیلۆی بە (٣٠٠) فلسە دەستیشی ناکەوێ .

کاوە - ئەی بەردێ لێ بارێ گۆشتی چی تەماتەی چی . بەخوا تا
مردن تەماتەوگۆشت بەچاو نابینی .

حەمەشین- ئەمە چییە ... بۆچی دەنگ نابێ .

کاوە - قەینیا کە بۆ دەنگ ئەبێ بەڵام تاکو ئێستا کە پارەمان
نەسەندووە . ماڵە وەمان نەدیوە لەسەر ئەم هەموو
کۆسپانەوە خواردنێکی پیاوانەمان بۆ لێنانێ ی .

حەمەشین - لەسەرخۆتان کوڕم لەسەرخۆتان .. من هەقم چییە ئەمە هەمووی
بە فەرمان و (سەیری فۆرمەن ئەکا و ئەترسێ) بە بڕیاری
خاوەن ئیشە . کاتێ دێت و تەماشای ئیشە کە ئەکا تەماشای
خواردن و خوراکتان ئەکا . ئێوە هیچ دەنگ ناکەن .. برایان ئێتر لە
سەرخۆتان کەی ئەمە ژیانە هەی رۆڵە ی مەردینە .

کاوە - تەنیا خاوەن ئیشە نیە .. زۆری کەس هەیە بەڕاستی ئەڵێم ئەوەی
ئەیەوی خواردنی چاک بخوا ئەبێ لە گیرفانی دەرکا .. ئەو پارەی لە
ئێمەی ئەبڕن ئەم خواردنە هی ئەو پارە نیە .

فۆرمەن - مەبەستت . ؟

کاوە - مەبەستم ئەوەیە نابێ ئێمە نۆکاو بخۆین و چەند کەسانێکیش
گۆشتی مریشک بخۆن هەمان پارەیش ئەدا کە ئێمە ئەیدەین .

سمکۆ - گوایە قسە ئیش قەدەغەیە .

فۆرمەن - کاوە ئەم جۆرە وتانە تازەیە لەسەر زمانت ... کێ خستی یە
مێشکتەوە ... کابرای فەیلەسووف . ؟

کاوە - فەیلەفووس کێیە ؟ .

حەمەشین - (بۆ ئەکەی) کوڕە فەیلەفووس نا فەیلەسووف .

بارام - حەمەشین گاڵتەیش ئەزانێ .

فۆرمەن - زۆر باشە... گەورە و بچووکیش نەماوە .

حەمەشین - کوترێ تاکو نەمرێ بە تەمای چاوە .

کاوە - (لە حەمەشین ئەدا) بۆ ئێمە کوترین .

حەمەشین - فۆرمەن فریام کەوە لێی پان دام .

فۆرمەن - ئەوە چیە هەرکەس بۆخۆیەتی شاری بێ خاوەنە.. زۆرباشە .

کاوە - ئەگەر شاری بێ خاوەن نەبێ ئاوها پاشاگەردانی نالێ پێم
نالێی حەمەشین چێشتکەرە یا خاوەن ئێشە .

فۆرمەن - بەلێ... لەسەر بڕیاری خاوەن ئێش چێشت ئەکا.. بەسە
ئێتر لێ بڕێنەوە بێتامتان کرد ... بینیتان لێ دەڵێم بۆیە
وا ئەکەن قەنیاکە باوابێ .

سەگۆ - وەستا کاکی خواردنیش پشوومان نیە .

فۆرمەن - ئەم وتانە هەمووی تازەیە.. لەوەتێ بارام هاتووە وای لێ
کردوون فێری هەموو شتێک بنا .

کاوە - وەستا بارام هەقی چیە لەم شتانە .؟

بارام - برایان بە سیەقی کاتتان بەسەر ئەچێ (ئەچیتە دەرەوە) .

(دەنگی کچە لادێیەک لە دەرەوە)

گوڵزار - مەریوان ... مەریوان ... مەریوان .

مەریوان - ها.. ئەمە دەنگی ئافرەتە !

حەمەشین - ئەی چیە گوایە وەک دەنگی تۆیە ئەمە دەنگی بولبولە .

گوڵزار - مەریوان ... مەریوان .

مەریوان - ئەمە دەنگی گوڵزاری ئامۆزامە.

( گوڵزار دێتە ژوورەوە )

فۆرمەن ـ تۆکێیت چیت ئەوێ ؟!.

گوڵزار ـ برام ئەمەوێ مەریوانی ئامۆزام ببینم .

مەریوان ـ گوڵزار چی تۆی هێنا بۆ ئێرە وەرە ژوورەوە .

گوڵزار ـ نا بەخوا نایەمە ژوورەوە ، ئامۆزا گیان .

فۆرمەن ـ (چاو لە حەمەشین دائەگرێ) بەڵێ پارچەیەکی باشە (بەپێکەنینەوە) ئەڵێی ئاسکەیە .

حەمەشین ـ قوربان ئاسکەی چی ئەڵێی پەریە .

فۆرمەن ـ وەرە ژوورەوە دەرەوە گەرمە (دەکی پائەکێشێ) وەرە مەشەرمەکە .

گوڵزار ـ دەکم بەردە برام .

مەریوان ـ وەستا دەکی ئامۆزاکەم بەردە .

فۆرمەن ـ لە سەرپیاوەتیکەمەوە لە بۆتی ئەهێنم ئاسکەکەت بۆ پڕاو ئەکەم ئەیهێنمە بەردەستت هێشتاکە ناڕازیت .

کاوە ـ وەستا ڵێی گەڕێ خۆشکم وەرە لێرە دانیشە مەریوان ئاوی بۆ بێنە .

گوڵزار ـ ئەرێ بەخوا زۆرم تینوە خودا وینەتان زۆر کا .

فۆرمەن ـ حەمەشین .

حەمەشین ـ بەسی فۆرمەن .

فۆرمەن ـ برۆ نیوە ڕۆژەی بۆ بێنە .

مەریوان ـ پێویستە ناکا خۆی خواردنی پێیە . گوڵزار بۆ هاتی بۆ ئێرە ! .

گوڵزار ـ تۆ منت هێنا .

مەریوان ـ من ؟! .

گوڵزار ـ ئەی لە تۆ زیاتر کێم هەیە .

مەریوان ـ چۆن ئەم ڕێگا دوورەت بڕی چۆن ؟ .

گوڵزار ـ لەگەڵ گزنگی هەتاوا لەگەڵ حەمەی برام دەرچووم ودەمکرد بە
گۆرانی وبالۆرە ، تاکو گەیشتینە ئێرە ئاگری خۆشەویستی وای لێ
کردم ئەم ڕێگا دوورە لەگەڵ حەمەی برام بڕم .

مەریوان ـ فەرموونان بخۆ تاکو حەمەی برات بانگکەمە ژوورەوە .

گوڵزار ـ ڕۆیشتن ، زۆر ماندووی کردم ... حەمەی برام لە دەرەوەیە
نایەتە ژوورەوە (بە هێمنی) مەریوان تۆ چی کاتێ دێیت بۆلای
باوکم تۆ ئەزانی هەموو دانیشتوانی دێیەکە باسی من وتۆ ئەکەن .

مەریوان ـ گوڵزار گیان من بۆیە ماندووم ، بۆ ئەوەی بەدەس بەتاڵی
نەیەم بۆلاتان .

گوڵزار ـ تۆ نەت ووت تەنها ساڵێک ئیش ئەکەم بە سەپارە پێکەوە ئەنێم .

مەریوان ـ (بە داخەوە) ئای .. نەم توانی پارە کۆ بکەمەوە .

گوڵزار ـ تاکو ئێستا کۆ نەت نەکردۆتەوە ئەی کەی ئەم ئاواتەمان
دێتە دی ... مەریوان چەن کەسانێک هاتن بە چەکەوە
سمێڵ زل وچوارشانە و تێک سمڕاو .

مەریوان ـ (بە تووڕەییەوە) چیان ئەویست .

گوڵزار ـ جا تۆ نازانی چیان ئەوێ .

مەریوان ـ نازانم .. نازانم بەڵام تۆ کچی مامی منی من بۆ تۆم تۆش
بۆ منی هەرکەس نزیکت بکەوێ مێشکی ئەپژێنم .

حەمەشین ـ (لە دوورەوە) وەکوو شیرین وفەرهاد .

فۆرمەن ـ جێی خۆیەتی ، تەواوە .

حەمەشین ـ وەکوو نوقل وایە .

گوڵزار ـ مەریوان من هاتم کە پێت بڵێم کە ئێمە کۆچ ئەکەین .

مەریوان ـ بۆ کوێ ئەچن ئەبجا بۆ کوێ ؟ .

گوڵزار ـ نازانم باوکم دوێنێ ووتی کۆچ ئەکەین .. دوێنێ زۆربەی ماڵەکەمان کۆ کردەوە لەم تاکو بەیانی ئەنووستین منیش لە دڵی خۆما ووتم کچە زیرە بڕۆ خۆت بگەیەنە مەریوان .

مەریوان ـ کچێ وانزانم باوکت خەیاڵی خرایە .

گوڵزار ـ ئەیرۆ خوا نەکا .. بەکاڵ ئەمە دەیشێ خۆم ئەکوژم (گوڵەکەی پشتی ئەکاتەوە) مەریوان ئەم پەشەڵەم بۆت کڕیوە بیکەرە بەرت ئەمە دیاری من بێت ، بەڵکو لەم موو کاتێک یادم بکەیتەوە .

مەریوان ـ یاخوا بەخێر بێت گوڵزاری خۆشەویستم .

گوڵزار ـ مەریوان خۆ لە بیرت ناچم یادم ئەکەیتەوە .

مەریوان ـ حەیف نیە من تۆم لە بیر بچێ ، چاو ئەکەمەوە لە بەرچاومی ... ئەخەوم خەو بە تۆوە ئەبینم ... ئاو ئەخۆمەوە وێنەی تۆ لە جامەکەدا ئەبینم .

گوڵزار ـ دەنگت بەرز مەکە ... شوورەیی یە پیاو دانیشتووە .

فۆرمەن ـ ئەم کچە چۆنە بۆنانی نەخوارد وادیارە ناتەکەی بەدڵ نیە ؟! .

گوڵزار ـ نازانم خودا بتان پارێزی من دڵم ناپا دڵم بە سەراوە جا ئەمەوێ بڕۆم .

فۆرمەن ـ من وای بە باشی ئەزانم تۆزێکی لە پشتی بمێنیتەوە .

سەمکۆ ـ (بە توورەییەوە) فۆرمەن .

گوڵزار ـ چۆن ئەتوانم لێرە زۆر دانیشم لەی وکارم ئەم کوڕن

مه‌ریوان ـ هه‌لـه‌ برۆ خێرا که‌ با بیم حه‌مه‌ی برات ببینم .
گوڵزار ـ تووڕه‌ مه‌به‌ ئامۆزا .. هه‌مووتان برای یه‌کن من ئه‌ڕۆم .
فۆرمه‌ن ـ به‌م شێوه‌ ڕۆیه‌ بۆ کوێ ئه‌ڕۆی . ؟
کاوه‌ ـ تۆ چیت به‌ سه‌ره‌وه‌یه‌ .
فۆرمه‌ن ـ من بۆ ئه‌وه‌مه‌ ئێوه‌ به‌ زه‌ بیتان به‌که‌سێ نایه‌ت چۆن مرۆڤایه‌تییه‌که‌ .
سکلێ ـ وا دیاره‌ هه‌رتۆ مرۆڤایه‌تی ئه‌زانی .
گوڵزار ـ بابرۆم پێش ئه‌وه‌ی شه‌ڕ ببێ .
مه‌ریوان ـ برۆ خودات له‌گه‌ڵ ( مه‌ریوان وگوڵزار ده‌رئه‌چن ) .
فۆرمه‌ن ـ ئه‌مه‌ چیتانه‌ دڵتان ئه‌لێ ی به‌رده‌ .
حه‌مه‌شین ـ فۆرمه‌ن ڕاستی ئه‌کا دڵی ئێوه‌ چۆن چۆنییه‌ !
فۆرمه‌ن ـ زۆرباشه‌ ... نرخمان لای که‌س نه‌ما .
کاوه‌ ـ فۆرمه‌ن نه‌ختێ دڵپاك به‌ .
فۆرمه‌ن ـ دڵی من چییه‌تی گورایه‌ وه‌کوو دڵی ئێوه‌یه‌ . ؟
حه‌مه‌شین ـ چاو به‌له‌ .
کاوه‌ ـ چیت ووت .
حه‌مه‌شین ـ نابێ که‌س ده‌ی بکاته‌وه‌ به‌ چاکوو به‌ خراپه‌ .
(بارام و مه‌ریوان دێنه‌ ژووره‌وه‌ مه‌هدی بان هه‌ڵگرتووه‌ )
کاوه‌ ـ ( به‌ په‌شۆکاوییه‌وه‌ ) چی لێ هاتووه‌ .
بارام ـ ( به‌ تووڕه‌یی و دڵ ته‌نگییه‌وه‌ چاوی بڕیوه‌ته‌ فۆرمه‌ن )
فۆرمه‌ن ئۆتۆمۆبێله‌که‌ت خۆشه‌ وپیت تر بوو له‌ گیانی مه‌هدی،
ئۆتۆمۆبێله‌که‌ت په‌خت نه‌کرد به‌لام مرۆڤێکت به‌ قوربانی

ـ ئۆتۆمۆبێلەکە کرد . تۆ نرخی مرۆڤ نازانی تۆ خوێن مژی ..
خوێنی ئەم کرێکارانە ئەمژی . ئەزانی فۆرمەن کە مەهدی مرد .
مەهدی مرد ئەم لاوەت قوربانی ئۆتۆمۆبێلە شڕەکەت کرد .
گوێ بگرە فۆرمەن پێویستە لەمەودوا نرخی مرۆڤ بزانی
ئێمە وا بە خاوی و سستی ناوەستین . ئەبێ مافی خۆمان لە تۆ
وەربگرین . تۆڵەی مەهدی بێ تاوان وەرگرین . ئەی کرێکاران
پەل بگرن لە پێناوی ئامانجی خۆتان ببینیتان چۆن مەهدی لە
پێناوی برسێتی و هەژاریدا جوانەمەرگ بوو . فۆرمەن و ـ
دەسە و دایەرەکەی سبەیش وەکوو درندە دێتە گیانی
ئێوەیش وەکوو مەهدی لە ناو ئەچن .
فۆرمەن ـ زۆر باشە قسە بکە چی لە دڵتا هەیە دەری برە بڵێ خێراکە
ئێستاکە بۆتان ڕوون بووەوە کە ئەمە ئەیەوێ خۆی سەرکەوێ .
بارام ـ فۆرمەن کاتی فرت و فێڵ نیە ـ کاتی درۆ و دەلەسە نیە بە زمانی لووسی
شێوەی تازەی داگیرکەران قسە مەکە هەر تۆ و چەند کەسی وەکوو
تۆ ، ئێمەی خستە ژێر چەپۆکی ئینگلیزەوە .
فۆرمەن ـ تەماشاکەن ئەگەر ئینگلیز نەبێ ئێوە چۆن ئەژین ... ئەم
قوتوو گۆشتە هی کێیە هی ئینگلیز نیە ؟ .
بارام ـ (بە توورەییەوە) تۆ شەرم ناکەی ئەم قسە پووچانە ئەکەی ،
ئینگلیز ئەمانەمان پێ ئەدا .. بەڵام ئایا ئەزانی بەچی جۆرێک خوێنمان
ئەمژی بەرامبەرمان ئەبا پیت و بەرەکەتی وڵاتەکەمان ئەبا .
ئەنجا ئەم قوتووە گۆشتەیش بۆ ئێمە نیە بۆ ئێوەیە ! .

خوڕەمەن - ئەم ووتانە هی تۆ نیە ! هی لە تۆ گەورەترە پێت ئەڵێن باش
ئەیان ناسین پاش چەند ڕۆژێکی کە چەند کەسێ فێشی ئەکەین .

بارام - من باسی مرۆڤی مەهدی ئەکەم ، یا باسی ئەم لاو ئەو ولا ئەکەم .

خوڕەمەن - (زۆر تووڕەیە) پێم نالێی بە تەواوی مەبەستت چیە ؟!.

کاوە - تکایە لێی بڕێنەوە بەسیەتی .

خوڕەمەن - ئەڕۆی بڕۆ ... نا ڕۆی خۆم ئەزانم چیت لێ ئەکەم ..

بارام - (بە تووڕەیی یەوە) گوایە ئەبێ چی بکەی ! .

...

«پەردە دائەدرێتەوە»

# پەردەی دووەم

(کات زستانە مەریوان و کاوە دەسکڵۆ خۆیان پێچاوەتەوە)

مەریوان ـ (جگەرە ئەپێچێتەوە) خوا ئەگەر ڕوو لە هەرکەسێك بگرێ وەکوو مێروولە باڵی لێ پەیدا ئەکا.

حەمەشین ـ حەوت شەو و حەوت ڕۆژە بەفر ئەباری تەنانەت زەوییەکەش دیار نییە باشە زەوییەکە چی لێ هات؟!... ئەی ئەم دێیە ناوی چی یە؟. ئوف . ف . ف . ف .

مەریوان ـ وەختە شەق بەری.

حەمەشین ـ ئاو نییە قاپەکانیش بشۆین.

مەریوان ـ تۆزێك بەفر بێنە و بیخەرە قاپێکەوە و بیخەرە سەر ئاگرەکە ئەتوێتەوە و ئەبێتە ئاو و تا قاپەکانی پێ بشۆی.

کاوە ـ ئەی مەهدی هەژار خوا لێت ڕازی بێت. چەند کوڕێکی باشی بوویت چەندیش گەر بوویت گوناهت بەئەستۆی ئەو کەسە کە لە ناوی بردیت.

حەمەشین ـ وەستا کاوە تفەنگەکە بەتاریکییەوە مەنێ.

مەریوان ـ وادیارە لێی ناگەی... کاکی خۆم پێشینیان ووتوویانە بووکێ لەگەڵ تۆمە خەسوو گوێت لێ بێ.

حەمەشین ـ هەتیوو چۆن لێی ناگەم من حەمەم... حەمە.

مەریوان ـ پێم ئەڵێی هەتیو... جارێکی کە پێم بڵێی هەتیو مێشکت ئەپژێنم لە بیرتە کە بە مەهدی خوا لێ خۆشبووت ئەووت

ـ (لاسایی ئەکاتەوە) کوڕە مەهدی نان بێنە ... قاپەکان بشۆ ...
کوڕە مەهدی ئاو بێنە . پێم نالێی مەهدی کرێکار بوو یا نۆکەر ؟.
حەمەشین ـ بڕوا بکە فۆرمەن خۆی ئەوی ووت مەهدی بنێرە .
کاوە ـ گوناهی مەهدی بە ئەستۆی سەبەبکاری .
حەمەشین ـ من هەقم چییە ! فۆرمەن ناردی ئەوشی برد کەس و کارەکەی
(٢٠) دینارییان وەرگرت لە حیاتی خوێنەکەی .
کاوە ـ نرخی مرۆڤ (٢٠) دینارە مرۆڤ بە نرخترین سەرمایەیە لە ژیاندا.
حەمەشین ـ ئەمە دونیایە هەروا بووە و هەروا ئەڕوا ...
خەلقی بە پارە دروست ئەکەن و ئەیفرۆشن .
کاوە ـ دونیا هەروا بووە بەڵام هەروا ناڕوا ... ڕۆژێک ئەبێ
کرێکار گەورەی خۆی ئەبێ . باشە حەمە تۆ گیانی خۆت بە
چەن ئەفرۆشی ؟.
حەمەشین ـ من گیانم بە ملیۆنێ دینار ـ نافرۆشم .
کاوە ـ ئەی چۆن ئەڵێی کەس و کاری مەهدی (٢٠) دیناریان
وەرگرت لە باتی خوێنەکەی . ئای چەن بێ ویژدانی ماماتێ
ویژدان بەش کرا تۆ لە وێ نە بووی .
مەریوان ـ بەخوا من گیانی بارامم لە گیانی خۆم خۆشتر ئەوێ .
سمکۆ ـ لە پێش دوو هەفتەوە تاکو ئێستا کە ئێمە لە ژێر بەفر و باراندین
ئەوەندە سارد بوو مەکینەی بیرهەڵکەنەکە تێک چوو فۆرمە-
نیش لە ناو شار بۆ خۆی ئەسوورێتەوە .. تێر ئەخوا و ئەخواتەوە.
حەمەشین ـ دە بە سیەتی با بنووین .

سمکۆ - کاوە گیان با بچەوین .. بەیانی ئیشمان هەیە (بەکلی قسە ئەکا).

کاوە - ڕاست ئەکەی .. بابە درو خۆمان بکەینەوە و (دەس بە پرخەپرخ ئەکەن).

مەهشێن - ئێوە خەوی ئێستا چەند خۆشە بۆ دەنگی بوون .

کاوە - قسە بەسە دە بچەوین .

مەریوان - (چاو لە کاوە دائەگرێ) چاوم هەڵناسێ ئەوەندە خەوم دێ .

سمکۆ - هەرچەندە وتم با بچەوین سبەی ئیشمان هەیە بەڵام مەریوان
گوێ نییە لە بلێی پێش نووستنمان . مەریوان چراکە بکوژێنەوە .

مەهشێن - بەخوا ڕاست ئەکەی خەوم لێ ناکەوێ گەر مۆسیقا و گۆرانی و
ئاوازی خۆش نەبێ .. چونکە لەگەڵ ئینگلیزەکانا ئەوەندە ئیشم
کردووە فێر بووم بەبێ گۆرانی و مۆسیقا خەوم لێ
ناکەوێ ( پلیس مۆزیکا ) .

مەریوان - (گۆرانی بە سەرکێکاران ئەڵێ) خۆشم ئەوێ دڵدارەکەم،
خۆشم ئەوێ ئەفا بەکەم ... (مەهشێن لە قینیا خەوی لێ ئەکەوێ).

بارام - (وەک لە دڕ ئیتە ژوورەوە) . مەریوان ... مەریوان .

مەریوان - (هەر گۆرانی خۆی ئەڵێ ئاگای لە هیچ نییە)

بارام - مەریوان ... مەریوان .

کاوە - بۆ دەنگە بێ وابزانم بارام هات ( هەموویان هەڵ ئەستن
بەرەو دەنگەکە ئەڕۆن )

بارام - (لەناوە ڕاستیانا ئەوەستێ) برایان هەرچەندە بڕیار وابوو سبەی
بتانبینم بەڵام لەبەر ئەوەی وا هەڵ ئەگرێ وام پێ باش بوو کە ئەمشەو بێ.

کاوە - زۆر باشە ئێمەیش حەز ئەکەین با ئەمشەو بێ .

یم - لەم چارەدا دەربارەی شتێك ئەدوێین کە لە ژیانی کرێکاراندا
ڕووی داوە هەروا لە ژیانی ئێمەشا ڕوو ئەدا ..

برایان پێویستە ئێمە بەرامبەر بە سەرمایەداران یەك گرین
بەرامبەر بە خاوەن ئیشی . چونکە ئەوانە دزی کرێکار و سەرقاپەتین
.. بۆ نموونە خاوەن ئیشەکەمان لەگەڵ فۆرمەنەکەمان ، ئەمانە
پارەپەرستن ، پارە کوێریانی کردووە لە پارە زیاتر هیچ نازانن و
هیچ ناپەرستن ئەبا یەدەری خوێنیمان بمژن .. بەڵام ئەگەر ئێمە
پێتو بەرابەر هەموو فەرمانە نارەواکانیان وفەرمانە ناپاکە
کانیان یەك گرین بە تەواوی یەك گرین ، ناتوانن مافەکانمان
بخۆن . چونکە لە ڕاستیدا مافی ئێمە فەوتاوە هەرئەبێ مافی
خۆمان وەرگرین هەرچەندە هەندێکمان لەئەفەوتێ و ئەبێتە
قوربانی ... ئەوقوربانییە چرای ڕوونکەرەوەی دووا ڕۆژی
هەموومانە . گەرچی خۆمان نەگەینە ئەو ڕۆژە بەڵام منداڵە-
کانمان ئەیگەنێ ... هیچ نەبێ با ئەوان دووای خۆمان بە
خۆشی بژین .

کاوە - باشە چی بکەین ، تاکو بگەین بە ئامانج ؟ .

بارام - یەك گرتن ... بەو یەك گرتنە سەربەستی وەرئەگرین ، ئەبێ
ڕێك و پێکی لەو ئیشەدا بەکار بهێنین چونکە خوتانا ئەزانن
ساتێك سەربەستی هەزار ساڵ دیلی ئەهێنێ .

سمکۆ - ڕاستە ووتراوە . مەڕی بۆ مردن بمرە بۆ ژیان
چۆن قازانج ئەکەی تا نەکەی زیان .

کاوە - کاک بارام، ئێستا ئەمانەوێ دەربارەی ئێشەکەمانە ڕێگەیەکمان بۆ دانێی.
مەریوان - ڕاستە ئەگەر چی ئەڵێی ئێمەش وا ئەکەین... کاک بارام من ئەو ڕۆژانەم
لەیاد ناچێ کە ئەو هاتی فێری خوێندنت ئەکردین.
بارام - خوێندن و زانیاری شۆڕشێکە بەسەر سەرمایەداریدا. برایان ئەمەوێ
هەمووتان فێری خوێندن بن، چونکە بە خوێندەواری بەسەر ڕیانا زاڵ
ئەبن هەروا داواتان لێ ئەکەم بە تەواوی دوژمنی خۆتان بناسن
ئەوکاتە ئەتوانن بە تەواوی بەسەر ڕیانا زاڵ بن. (بەیانی نزیک
بووەوە لە دوورەوە ئەفسەر و پۆلیس و خاوەن ئێش و فۆرمەن
دیارن) زۆر ئاگادار بن دەوروبەری خۆتان بن، پاراستنی زۆر
مەبەستە بە فێری خۆتان مەدەنە دەستەوە.
خاوەن ئێش - زۆر باشە بارام!.
فۆرمەن - چەند بەلامەوە مەبەست بوو بەم جۆرە بگیرێن.
ئەفسەر - تۆ ناوت چییە؟.
بارام - (دەنگ ناکا).
فۆرمەن - بە شێمانە چۆن ئەتوانێ قسە بکا.
ئەفسەر - پێتم نەووت ناووت چییە؟!... بارامی یانا.. ئێشت چییە؟.
بارام - بەڵێ بارام... کرێکاری ئێشم.
فۆرمەن - فەرموو قوربان با بڕۆین بۆ ئەوبەرە کە لەوێ لێیان ئەکۆڵینەوە
(ئەچنە ئەوبەرەکەوە حەمەشێن نووستووە پرخەپرخی دێ). - حەمە
.. حەمە حەمە لە.. حەمە لە ئەوا ئەو ڕۆژەیە کە چاوەڕوانی بووین.
حەمەشێن - تو خودا لێم گەڕێ با بنووم کاتی گاڵتە نییە!.

فۆرمەن - کوڕە گاڵتەی چی . بێ فەرابی هەڵسە باراممان گرتووە .

سەپشین - فەرموو .. فەرموو هەنابێ مەعاوین .

ئەفسەر - (بە خاوەن ئیش) ئەمە لە زووەوە کۆبونەوەیان لەگەڵ ئەکا ؟ .

خاوەن ئیش - بەڵێ وەکو فۆرمەن ئەڵێ لە زووەوە خەریکە لەگەڵیان .
قسە بە هەموومان ئەکا .. بە حکومەت بە مەلیک بە ئینگلیزەکا
-نیش . ئەی ئیشە بۆ ئینگلیز ئەوت دەرنا کەین ئەوان ئەبن
ئیمە چین .. ئەیانەوێ مان بگرن .. بیستووشمە ئەوەمان
گرتنەیان لەکارباغی ئەبێ هەموو کرێکارانی ئەوێ تییا بەشدار
ئەبن .

فۆرمەن - گەورەم ئەوەیش بزانە ئەم کرێکارانە هەژارن هیچ نازانن بەڵام
ئەم بارامە تێ گەیشتووە فێریان ئەکا .

ئەفسەر - ئەم جارە با لە بەندیخانەدا فێریان بکا .

کاوە - بەڵام گەورەم بارام لە دژی کەس قسەی نەکردووە ! .

ئەفسەر - تۆ ناووت چی یە ؟ .

کاوە - ناووم کاوە یە .

خاوەن ئیش - (ئیشارەت ئەداتە ئەفسەرەکە لێی گەڕێ) .

ئەفسەر - رەحیم .

رەحیم - بەڵێ گەورەم .

ئەفسەر - بچۆ بەرەو ناو ئۆتۆمبێلەکە (بارام و تۆڵیش کە ئەچن بۆ ناو ئۆتۆمبێلەکە)

فۆرمەن - ئاگات لێ بێ دەستی لەکەلەپچە بدە ، چونکە تێ گەیشتووە
زۆرزانە ، نەوەک لە رێگا لە دەستت را بکا .

(پەردە دائەدرێتەوە)

# پەردەی سێیەم

( هەمان جێگا لە پاش مانگێک )

سمکۆ ـ ( لەپڕ هاوار ئەکا ) حەمە ... کاوە .. مەریوان .

حەمە ـ ( دێتە پێشەوە هەویری بەدەستەوەیە )

سمکۆ ـ مەریوان ... مەریوان .

حەمە ـ ( تەماشای ئەکا )

سمکۆ ـ مەریوان ... مەریوان .

حەمە ـ سمکۆ تۆ ناموستە ، پێم نالێی چیت ئەوێ .

سمکۆ ـ تۆ لێرەی هەی بەساقە تەماشاکە ... تەماشاکە

حەمە ـ چییە چی رووی داوە ؟! .

سمکۆ ـ ئۆتۆمۆبێلی کۆمپانییەکە واهات .

حەمە ـ راستە ... بگرە ( هەویرەکە ئەداتە دەس سمکۆ ... بە تازەوە سەما ئەکا ) . سەمرون و هێلکەوزەلاتە ، پڕە لە پیازو تەماتە بخۆ بلێ چەن حەیاتە .

سمکۆ ـ ئەمانە زۆرن لەناو ئۆتۆمۆبێلەکە ئەترسم خۆیان نەبن .

کاوە ـ ( دێتە دەرەوە ) یەک و دوو سێ ... سێیان لەسەر پێکا بەکەون .

مەریوان ـ وادیارە بارامیان لەگەڵدا نیە ! .

حەمە ـ خۆرمەن هەی گیانە ئەم خۆرمەن خودا بیتپارێزێ خۆرمەن چەن جوان ئۆتۆمۆبێلەکە لێ ئەخوڕێ .

مەریوان ـ ئۆهۆو ... ئۆهۆ ... دەستی کرد بە فڕوفێڵ مام حەسەنی بەسە .

کاوە ـ پیرباڵ و فەلامەرزو باپیرە ... بەڵام وەستا بارام لەگەڵیا نا
نیە ... ئۆ هۆزخاوەن ئێشەکەیشی هاتووە .
مەریوان ـ پێتم ناڵێ ئەمە مانگێکە بارام بۆ دیار نیە ؟ خۆ بەکەفالەت
بەربووە بۆچی نەگەڕایەوە بۆ سەر ئێش ! .
کاوە ـ بەخودا تۆیش لەمن هەژارتری ، ئەی نازانی جارێکی کە لە زیندان
توند کراوە .
خاوەن ئێش ـ ئەم کاتەتان باش .
پیرباڵ و فەلامەرزو باپیر ـ سەلامون عەلەیکم .
هەموان ـ عەلەیکوموسەلام ... بەخێر بێن بەسەرچاو .
کاوە ـ یاخوا بەخێر بێن .
پیرباڵ ـ بژی براگیان کاوە .
هەمەئێ خاوەن ئێش باوکانە ، مانگە و لەسەرسەرمان هەڵاتووە و
دونیا بەرەمیییەوە پێ ئەکەنێ .. بابڕۆم کورسییەک بێنم .
مەریوان ـ فەرمووجەنابی مودیر .
سمکۆ ـ وەستا فەرموونامەت لەکەی دکارمانە وەهێنیا ؟ .
نۆرمەن ـ (یادی ئەکاتەوە) .
سمکۆ ـ کاک نۆرمەن لەگەڵ تۆمە ئەگەر لەناو ئۆتۆمۆبێلەکەیە
بابڕۆم بیهێنم .
نۆرمەن ـ بزانە ... بزانە چۆن نیشکێکم هەیە ! چۆن لەیادم چووە
سمکۆ ـ لەیادت چوو ؟ .
نۆرمەن ـ ئێستاکە کاتی ئێشە یا کاتی نامەیە ، پێتم ناڵێ ی مەکینەکە بۆوەستاو

- بیرەکەتان تەواو کرد یانا ؟ بڕۆ وەڵامم نادەنەوە .

کاوە - تەواو نەبووە .

فۆرمەن - ڕاستە ئەکەی یانا ؟ .

کاوە - زۆر ڕاست ئەڵێم ... باش تەماشا کە .. تەماشای دەموچاومان کەلە چنۆکە ئەکەین ئێمە سێ مانگە وەکوو دڕندە لێرەین ، بەڵام چۆڵە وەخەبەری ماڵەوە نازانین جەنابیشت ئەڵێی نامەی چی ! کاتی نامەیە یا کاتی ئیش ، هەی ئیش سەرت بخوا .

هاوەڵ ئیش - تکام وایە خۆتان یاد لە هەموو شتێلە بکەنەوە ئیش کردن لە سەر هەموو شتێلە وەیە .

فۆرمەن - گەورەم بیستمە ئەمانە پیش زمانیان لە باڵام درێژترە ، پێویستی بە قرتاندن هەیە ... پێیم بڵێین بۆ مەکینەکە وەستاوە ( بە توورەیی بیەوە )

خاوەن ئیش - بێوونا ...چۆن ... مەکینەکە شکاوە ئەو مەکینەیە ( ١٥ ) هەزار دینارم پێ داوە چۆن هێشتان بشکێ .

کاوە - ئێمە شکاندمان یا بەفر شکاندی ، ئێمە چی بکەین گوایە ئەتوانین نەیەڵین بەفر بباری .

فۆرمەن - بەڵێ ئەبێ نەیەڵن ئەتوانن دای پۆشن .

مەریوان - بەچی دایپۆشین ! چیمان لەلایە تاکوو دایپۆشین .. ئەڵێی کێوە بەچی دا ئەپۆشرێ ؟ .

فۆرمەن - بەڵام من پێشنیارێکم هەیە چەندت زیان لێ کە وتووە بە ماڵی ببڕێ ... لە مووچەکانیان ببڕە .

مەریوان - هەر ئەمان مابوو ! لە سەر بارەکە یشەوە سەربارێکی لە سەر بێ .

فۆرمەن - بێ دەنگ بە ... (بە تووڕەییەوە)
مەریوان - بێ دەنگ نابم ، چۆن سوورچەکانمان ئەبڕن . بێچمەکەی
مەکینەکەمان شکاندووە ! .
فۆرمەن - کوڕە تۆیش لە دەس دەرچووی (ئەیەوێ لێی دا کاوە و سەکۆ
نایەڵن) بینیتیان هەموویان دەکوڕیەڵ وان هەموو بە قسەی بارام
ئەکەن ... تاکو ئەم مشکەکوێرەیش لەگەڵیانا (بە نیچە بۆ مەریوان
ڕا ئەکێشێ) .
خاوەن ئیش - فۆرمەن ئەمان کوڕی باشن ئەوان هەمیان چی یە لە
سلێنەر ... حەمە ... حەمە .
حەمە - بەڵێ قوربان .
خاوەن ئیش - ئەو شتانەی کڕیومانە لە ئۆتۆمۆبێلەکە دایگرە باشان
قاوەیەکمان بۆ دروست کە .
حەمە - ئەمری بەگم بەسەر سەرم ، بەسەر هەردوو چاوم .
فۆرمەن - دە بڕۆ هەتیو دە بڕۆ ، بەسەر چاووم ، چیرو چاوەت خواتەوە
(لاسایی ئەکاتەوە)
خاوەن ئیش - لەمەودوا من خۆم هەموو هەفتەیەک چیتان ئەوێ
بۆتان ئەکڕم .
کاوە - خودا تەمەنت درێژ کا ... وتیەت زۆر کا .
خاوەن ئیش - ئێوەیش لەبەر خاتری من چاوتان لە بێشەکەبێ لەگەڵ فۆرمەن
چەن و چون مەکەن ، ئێوە ئەزانن کە بیرەکەی (شۆڕاو) نەوتی دەر
نەچوو ئەویش بە هۆی یەکێکی شێردشینەوە بوو .

مەریوان - ئەویش بە قسەی فۆرمەنەوە بوو کە نەوت دەرنەچوو .

فۆرمەن - کوڕە بەسیەتی ( ئەیەوێ لێی بدا ) .

کاوە - بۆچی نایەڵی قسە بکا چونکە ڕاستە ئەگا لەم زەمانەدا قسەی ڕاست
قەدەغەیە ئەبێ دەمت بەستراوە بێ چاوت کوێر بێ ئەوەی
ڕاستە بێ نەیلێیت .

فۆرمەن - بە ڕاستەوە ... زۆر باشە من پیشانتان ئەدەم .

کاوە - تۆ ( ئیشارەت بۆ فۆرمەن ئەکا ) لەگەڵ دەستە بارامدا چەن و
چونت ئەکرد ئەیەویست بیرەکە زیاتر هەڵکێنێ بەڵام تۆ نەتهێشت
وخۆت بە فۆرمەن ئەزانی .. تۆ هیچ لە فۆرمەنی نازانی تەنها بۆ درۆ
و دەلەسەو مل شکاندنی کرێکارەکان دەستێکی باڵات هەیە .

خاوەنئێش - بهێڵە با قسە بکەن . من مەبەستم ئەوەیە کە ئێمە یەک خێزانین
ڕاوێژ کردن ئەمانگەیەنێتە بەرهەمێکی باش و ئێشێکی چاک و پاک .

حەمە - ( هەموو شتەکانی لەناو ئوتومبێلەکەدا ئەگرێ ) - هەمەن و هێلکە و
زەڵاتە ... لەگەڵ نانەر پیازو تەماتە بیخۆن بە نۆشی حەیاتە .

خاوەنئێش - فەرموو دانیشن ئێمەیش وەکوو ئێوە هەژار بووین شەو و ڕۆژمان
لەگەڵ کرێکاراندا ئەکردەوە هیچ جیاوازییەک لە نێوانماندا نەبوو .
هەرچەندە ئێستا کە خاوەن ئێشین ، فەرموو دانیشن . دانیشن لەسەر
ئەم بەردانە هەموون و هێلکە زەڵاتە بخۆن .

سمکۆ - فەرموو گەورەم لەسەر ئەم کورسییە دانیشە .

خاوەنئێش - نەی . نەی ئێمە ئەمان ووت هەموومان پێکەوە دائەنیشین
( هەموو دائەنیشن لەسەر بەردەکانە )

هەموان - بەخێر بێی گەورەمان .

خاوەن ئێش - سوپاستان ئەکەم .. هەموو کاتێکە پێم خۆشە پڕ دڵ خۆشی ورەم
بەڵکە نیشە وەبێتان بینم بەشەرەفم بەم جۆرە ئێوە ئەبینم
زۆر پێی ئەگەشێمەوە .

کاوە - گەورەم چۆن پێ بکەنین .. ئەمە چەندێکە لەسەرمانە رەبەنە ئەڕێن .

خاوەن ئێش - لەمەودوا تانە پەرەق نییە .. ئەوکاتە رۆیشت
نابێتەوە . خۆرمەن ... خۆرمەن .

خۆرمەن - بەڵێ گەورەم .

خاوەن ئێش .. لیستەی هەموو چەکانە بهێنە بزانە بەڵێ چەندی بەر ئەکەون .

خۆرمەن - بەڵێ گەورەم .

خاوەن ئێش - تەماشاکەن کوڕەکانم قسەیەکی بچووک هەیە بەپێویستی ئەزانم
پێتانی بڵێم .. راستیش لەسەر هەموو شتێکە وەیە ... پیاو ئەبێ
بەئارەقی ناوچەوانی خۆی بێ بگەیەنێ ئێوە ئەزانن بەشدارەتم
بۆ ئەم ئیشە هەموو زەرەرەکە نەوتی دەرئەچوو ئینگلیزەکانە
پارەم نادەنێ و ئەو پارانەیشم هەیە نامرەنێ . هەروا مەکینەکە
شکاوە زەرەرم لێ ئەکەوێ ... ئەرچەندە چۆن برایەکی کرێکار باوەڕم
پێ ناکەن . بەڵام متمانەم هەیە بە ئێوە (ئیشارەت ئەداتە پیرباڵ و
مەلا مەرزو باپیر) تکایەکم هەیە لە ئێوە بڕوا بە قسەکانم بکەن
... منیش لە دوایدا هەموو شتێکتان بۆ ئەکەم .

خۆرمەن - (لیستەی حیسابی ئەعطێ) فەرموو بەگم .

خاوەن ئێش - (لە دەستی وەرئەگرێ) ئێوە ئەزانن گیر و گرفتی دایەرەکەمان و

- باجیان .. لەبەرئەوەی من دوو لیستەم هەیە لیستەیەکیان پارەکەی کەمە .. لیستەی دووەمیان پارەکەی زۆرە .. لەبەرئەوەی ڕزگاربین لە گیروگرفتی دایەرەکانە پێویستە هەر دوو لیستەکە ئیمزا بکەن ئێوەیش ڕزگارتان ئەبێ .

( خاوەن ئیش لیستەکانە ئەخوێنێتەوە )

فۆرمەن - گوێ لە ناوەکانتان بگرن .

خاوەن ئیش - سمکۆ مەحموود .

سمکۆ - بەڵێ گەورەم .

خاوەن ئیش - وەرە پەنجەت درێژکە و مۆری کە .

سمکۆ - گەورەم بەی خوێنمەوە ئەوکاتە مۆری ئەکەم .

خاوەن ئیش - بۆ .. ؟ ! بڕوام پێ ناکەی .

سمکۆ - نا گەورەم بەڵام وا باشترە .

خاوەن ئیش - وەکو پێم ووتی ئەم ژمارەیەی لە لیستەکەدایە بەشێکە .. مووچەیشی بەشێکە . وەکو مووچەیەکە ئێم دانا وە بە وەستانی میکانیک مانگی (٤٠) دینارە .

سمکۆ - بۆ ؟ گەورەم مووچەکەم زیادی کردووە خودا تەمەنت درێژکا

خاوەن ئیش - مووچەکەت (٢٠) دینارە بەڵام وەکو پێم ووتی گیروگرفتی دایەرەکانە ... لەبەرئەوە (٤٠) دینارم نووسیوە .

سمکۆ - گەورەم ئەمە چۆن ئەبێ کەوا گردەی من و بردەی تۆ ؟ باشە لەبەر چی لە لیستەکەدا (٤٠) دینارە مۆری ئەکەم (٢٠) دینار وەرئەگرم .

خاوەن ئیش - تۆ کوڕێکی باشی ئەبێ لە خۆشی و ناخۆشیدا لەگەڵمانا بی

- (لیستە ئەخوێنێتەوە) سمکۆ وەکوو دوو تمان مووچەکەت (٢٠)
دینارە لەگەڵ ئەوەشدا چەنێ قەرزاری پێمانە .
خۆرمەن- مانگی (١٢) دینار قەرزارە ،
سمکۆ- چەن .. چەن ؟! .
خۆرمەن- مووچەکەت (٢٠) دینارە (١٢) ی لێ دەرکە (٨) دیناری
ئەمێنێتەوە . بەس مانگە ما هەموو ئەکاتە (٢٤) دینار .
خاوەنئیش- وەرە کوڕم مۆری کە مووچەکەت وەربگرە .
سمکۆ- دەڵێ خودا لێتێ ڕازی نەبێ دەس بە باڵتانەوە نەگرێ
لەسەرچی مۆری کەم ئەتانەوێ ماڵم وێران کەن ... دەڵێ خودا
ماڵتان وێران کا ... ئەتانەوێ منالەکانم لەبرسا بمرن ... بەس
مانگە فلسێکم وەرنەگرتووە بە حیسابی لیستەکە ئەکا (١٢٠)
دینار خودا ئەمە قبوول ناکا ئاخر چۆن ئیمزای کەم لا حەولە
وەلا قووەتە ئیللا بیللا لە دەسی ئەم زاڵمانە .
خاوەنئیش- (لێ ئەکەی) جوانە برادەرەکەمان بڕۆیتە ووتار بێژ...
تۆ ... لەولاوە ڕاوەستە ... وەرە کوڕم کاوە مۆری کە ،
کاوە- مۆری ناکەم .
خاوەنئیش- لێ بلێ چی تێگەیشتی وا بەکێسەر ئەڵێی مۆری ناکەم .
کاوە- پێویست بە ڕوون کردنەوە ناکا ... لەپێشەوە لە هەموو شتێک گەیشتووم ،
خاوەنئیش- مووچەکەت لەوان زۆرترە .
کاوە- لەهی ئەوان زیاتر نیە ئەگەر کەمتر نەبێ .
خاوەنئیش- وەرە سەریوان مۆری کە .

مەریوان ـ مووچەم نادرێ .

خاوەن ئیش ـ وەرە پیربال ( نایەت ) فلامەرز ( نایەت ) ئەتۆ بابیر ( نایەت )

هەرچۆنێ بێ ئێستا زانیم چی ئێوەی پەستکردووە... وەرن

مۆری کەن ( کەس نایەت ) کە شتان مووچەتان نادرێ .. مەریوان تۆ !.

مەریوان ـ ئەو پارە چونە زۆرە کە بەمنی ئەدەی لە منەوە دیاری بێ بۆ تۆ .

فۆرمەن ـ لاڵ بە هەتیو .. باشە چارەت ئەکەم .

مەریوان ـ کورە برۆ هەی چڵکاو خۆری ئینگلیز سپیلنیکت بەلای

دەستەوە نادە ئەڵێی باوو باپیرت هەر پایپ یان کێشاوە .

خاوەن ئیش ـ ئێستا کە کەس پارەی نادرێ .. زۆر باشە فۆرمەن با برۆین

بۆماڵی ئاغا . تاکو ئاغا خۆی بێ و لەگەڵیانا قسە بکا .

فۆرمەن ـ عەمەتۆیش لەگەڵمانا دەرە .. من بۆ ئێوە مە .

( ئەڕۆن بەڵام کرێکارەکانە بێدەنگن ).

سمکۆ ـ ئێستا چی بکەین !.

کاوە ـ ئەبێ بەپێی ووتەکانی بارام بجووڵێینەوە ( لە یەک نزیک

ئەبنەوە ) . وەرنە پێشەوە .)

مەریوان ـ من پە ئەوم کەکەم لەگەڵتانم .

پیربال ـ هەموومان یەک دەورێکمان لیەیە .

مەریوان ـ داخ بۆ وەستا بارام کە بە دڵ وگیان لەگەڵمانا بوو بەپرستی جێگاکەی

دیارە .

کاوە ـ ئێستا چی چی ئەڵێن .. ڕێک کەوتن یانا ؟ .

هەموویان ـ ڕێک کەوتین ... زۆر باشە .

سەمکۆ - من وورتەیەکم هەیە .. ئەم وورتەیە سوورد بەخشە سوودی بۆ خۆمان و
هەموو نەتەکی کەیشی هەیە - . پاشایەک فیلێکی گەورەی هەبوو .
مەریوان - یەعنی بڵێین مستێ بەقەد خۆرمەنێ ئەبوو .
کاوە - ئەکاتە کاتی گاڵتە وگەپ نییە ! .
سەمکۆ - وەکوو وورتمان پاشایەک فیلێکی گەورەی هەبوو....
مەریوان - یەعنی مستێ بەقەد خۆرمەنێ ئەبوو .
سەمکۆ - کاتی گاڵتە نییە کاتی ئیش کردنە ( نەخشێ ئەوەستێ ) وەکوو
وورتمان پاشایەک فیلێکی گەورەی هەبوو... فیلەکە هەموو رۆژێکە
بەناو شارا ئەگەڕا بە ئارەزووی خۆی شتی تێک ئەدا منالی ئەشێلا
... بەشە قامەکانا بە قوڕتووڕمە درێژەکەی ساواڵی هەڵ ئەگرت و
هەڵی ئەدا تا کوو شارەکەی دا بەسەریەکا .
مەریوان - گوایە شێت بوو .
سەمکۆ - رۆژێک لە رۆژان دانیشتوانی شارەکە کۆ بوونەوە وویستیان
یەکێک سەرکردایەتیان بکا ... پیاوێکی پیریان هێنا تەگبیریان کرد
ئەم پیاوە پیرە بچە نە سەر شانیان لەبەردەم کۆشکی پاشادا بە
هەموو دەنگی هاوار بکا و بڵێ ... پاشا فیلەکەت .. ئەوانیش بڵێن:
لێ بەستەوە .. بەم جۆرە خەڵکی شارەکە چوونە بەرماڵی پاشا
کابرای پیرە لە بەردەم هەموویانەوە راوەستا و بە دەنگی بەرز
هاواری کرد : ئەی پاشا ... ئەی پاشا .
( کاتێ پاشا گوێی لەم دەنگە بوو دەرچووە دەرەوە و سەیری
کرد پیرێک هاوار ئەکا ) . ئەی پاشا فیلەکەت .. فیلەکەت

– لەلایەن خەڵکەوە چاوەڕێی وەڵام بوو .. تەماشای
کرد هەموویان وەکوو بوت وەستاون .. بێ دەنگ سەعێ بارەی
کردەوە ئەوە ووتی .. ئەی پاشا منیش کەوتمە دیسانەوە وەڵام
نەبوو چوار جار پێنج جار تاکوو شەش جار گوێی لە وەڵام نە بوو
لەم کاتەدا پاشا تووڕە بوو ووتی تۆ چیت ئەوێ لە منیلەم
کابرای پیرە ووتی گەورەم خێڵەکەت ناتوانێ بە تەنیا بژی ..
ئەبەوێ ژنی بۆ بهێنی تا بە هووتە هەردوولە بە ناو شارەکەتا
بێن و بڕۆن و بۆ خۆیان ڕا بوێرن .

کاوە- (بە تووڕەیی یەوە) خا براگیان ئێمە بەو جۆرە نابێ .

هەموویان- ڕاستە ئێمە ئامادەین بیک ئەگرین و لەگەڵتاین .

مەریوان- پیاو قسەی دا پێویستە جێ بەجێی بکا .

کاوە- بێ دەنگ بن والهاتن باپینە باڵا مەبینە و بەردەکانەوە
... بیرەکە یا ئەبێتە گۆڕی ئێمە یا گۆڕی ئەوان .

سمکۆ- ئا ... کاتی خۆم بەم جۆرە ئەبێ وەکوو ئیوە ووتی چەند پارچە ئاسن
هەیە کۆی ئەکەینەوە چانە گە پێویستی کرد بە کاری ئەهێنین .

کاوە- خێرا ئەوە هەرکەس بۆ جێی خۆی .. هەرکەس بۆ جێی خۆی .

(هەموویان ئەچنە دەرەوە شانۆ بە بەتاڵی ئەمێنێ گوێیان
لە دەنگی ئۆتۆمۆبێلەکە ئەبێ نزیک بۆتەوە هەروا خاوەن ئێش و ئاغا
و چەند چەکدارێ لەگەڵ هەمەشێن و خزمەکانی دێنە ژوورەوە) .

خاوەن ئێش- ئەرێ ئەوانە چییان لێ هات بۆچی جێگایەکە ڕۆیشتن ... غەریبوو ئاغا.. غەریبوو .

ئاغا- سوپاس ... سوپاس .

خاوەنئێش - ئاغا لە پاشان مەکینەکە ئەبەینە زەوییەکەی تۆ لەوەوە ئەوە
بیرەکە پاڵ ئەکەینەوە .. ئەمە هەڵەیەکی میکانیکی بوو . ئەو کابرا ـ
یە شمان دەرکرد .. هەرچەندە برادەرەکانیشی پێیان ناخۆش بوو .
ئاغا - خۆزگە ئەم کابرایەم بدیایە ... تاکو ملیم بیپڕاندایە ،
خاوەنئێش - خورەمەن ... حەمەشێن .. تۆ حەمە کورسییەک بێنە بۆ ئاغا
تۆیش خورەمەن بزانە کرێکارەکان لەکوێن وا دیار نەوەستوون ؟ .
خورەمەن - ئەمرەکەی گەورەم .
خاوەنئێش - بەداخەوە ئەگەر ئێمە بیرەمان بەتەواوی لەگەڵدا بە ئینگلیزەکانە
پارەیەکی زۆریان ئەدا پێمان .
ئاغا - من بە ئاواتی زەوییەکەی خۆمەوە بووم نەوتی لێ دەرچێ .
خاوەنئێش - زۆر ئاسانە ئاغا گیان .
خورەمەن - گەورەم کەس دیار نییە نازانم لەکوێن !؟ .
خاوەنئێش - ئەترسم ڕۆیشتبن .
خورەمەن - لەو بڕوایەدا نیم (هاوڕێکەکا) کاوە ... سمکۆ .
کاوە - ئێمە لێرەین . (لە دوورەوە) .
خورەمەن - با بڕۆم بزانم چی ئەکەن .
خاوەنئێش - بڕۆ بزانە چاوشارکێ ئەکەن تازە منداڵ بوونەتەوە
پێیان بڵێ با بێن بەخێرهاتنی ئاغا بکەن .
خورەمەن - ئەمرەکەی گەورەم (ئەڕوا بۆلای مەکینەکە لە ناکاو دەنگێ
ئەبیستێ) ئاخ ... سەرم ... بەرم دەن .
خاوەنئێش - خورەمەن .. خورەمەن .

کاوە ـ فۆرمەن لامانە بەری نادەین .

خاوەنمڵک ـ ئێوە ئەڵێن چی میۆن بەری نادەن (ئەیەوێ نزیک بێتەوە)

کاوە ـ لای خۆت بوەستە ... یەک هەنگاو نەیە پێشەوە .

خاوەنمڵک ـ وەرن بزانم مەسەلە چی یە ؟! .

کاوە ـ ناتۆ نەگەی چاکترە .

خاوەنمڵک ـ چی یە ؟ مانگتان گرتووە ؟!

کاوە ـ چی پێ نادێ تۆ لای خۆت و ئێمەیش لای خۆمان .

ئاغا ـ (دەمانچەکەی دەرئەکا) بەرم دەن باسەریان پان کەمەوە .

کاوە ـ تۆ کێ ی ئەتەوێ خۆت بنوێنی .

خاوەنمڵک ـ ڕاوەستە ئاغا ئەوە تاقمی بارزانی ... کەوا بیرۆکەیان تێک دا .

ئاغا ـ ئاوها ... بەرم دەن باسەریان بیرم .

خاوەنمڵک ـ ڕاوەستە ئاغا ڕاوەستە (هاوار ئەکا) فۆرمەن بەردەن ...
دوای لەیەک قۆ ئەگەین .

کاکۆ ـ بەری نادەین ... ئەو مافانەی هەمانە بۆمانی جێ بەجێ
بکەن ئینجا بەری ئەدەین .

خاوەنمڵک ـ ئۆی ... دەباشە تێم گەیەنن بۆ خاتری خودا چیتان ئەوێ .

کاوە ـ لە پێش هەموو شتێکا ئەم مانەوەی دەستمابارام بگەڕێنەوە
سەر ئیشەکەی خۆی .

حەمە ـ ئەمە یەک .

خاوەنمڵک ـ (بە چپە بە ئاغا ئەڵێ) ئاغا بارام ئەوەیە کەبیرۆکەی تێکدا .

ئاغا ـ کەواتە بەرم دەن ئەگیانیان . (خۆی ڕا ئەوەستێنێ) .

خاوەن ئیش ـ هێشتا ماوەیە لێ (هاوار ئەکا) ئیتر چیتان ئەوێ؟ .
کاوە ـ فۆرمەن لە ئیش دەرکەن و دەستبەرداریم لە شوێنەکەی ئیش بکا
چونکە فۆرمەن بیرەکەی تێکدا ئێمە هەموومان شایەتین .
حەمە ـ ئەمە دوو .
خاوەن ئیش ـ بە ئاغا درۆ ئەکەن ... ئیتر چیتان ئەوێ .
کاوە ـ تەماشا کە خاوەن ئیش ... ئەمانەوێ پارەکەمان بە جۆرەی ئەو
لیستەیە بێ کە برلای حکومەت ئەبڕوا هاوار وەکو چۆن خۆتان ئەڵێن .
حەمە ـ ئەمە سێ .
سمکۆ ـ ئۆتۆمۆبێلەکە پێش لە ژێر دەکی خۆمانا بێ .
حەمە ـ ئەمە چوار .
مەریوان ـ ماوەی پشوومان بە پێی یاسای کرێکاران بێ .
حەمە ـ ئەمە پێنج .
خاوەن ئیش ـ (بە ئاغا ئەڵێ) ببینە گەورەم ئەمە ئەو کرێکارانەیە کە
چەندجار بۆی هێنام ... ئەمانە چۆن ئاژاوە ئەنێنەوە ... ئەم
شتانە لە هەموو شوێنێ بڵاو ئەبێتەوە. تا لای جوتیارانیش
رەنگی ئەداتەوە .
ئاغا ـ بە ئیمانم هەموویان ئاژن .. چەرمە ئەمانە بڕین کوشتنیان فەرزە .
حەمە ـ راستە گەر یەکێک بەرانبەر خاوەن ئیش بوەستێ کوفرە . دەوەرە
پیاوە لێ لەگەڵ ئەمانەدا بکە .. بە خودای بە دەس
من بێ هەموویان لەناو ئەبەم .
خاوەن ئیش ـ تەماشا کەن ... گەر لە پشت مەکینەکەوە دەرنەچن بەرگولەتان

— ئەدەین .

مەریوان - بە تۆیشی لێیان دەدەن بێیە دەرناچین ئێوە تەنیا مانای
گوللە ئەزانن، وائەزانن گوللە هەموو شتێکتان بۆ ئەکا .

— سەلۆ - خاوەن ئێش خۆت بنوێنە ئەمە سنگی ئێمە و گوللەی ئێوە .

خاوەن ئێش - لەگەڵ ئەمانە هیچ سوودی نیە (بە ئاغا ئەڵێ).

ئاغا - (دەس بۆ چەکدارەکانی درێژ ئەکا و دەس ئەگرێ بە تەقە) .

حەمە - (ئەچێتە ناو بەرمیلێکەوە) وا بوو بە شەڕ .

ئاغا - بیانکوژن ... بیانکوژن . (شەڕ دەس پێ ئەکا لە مابەین پیاوەکانی
ئاغا و کرێکارەکان ... بە گوللە ، بە پارچە ئاسن ، بە چەکوش ،
بە بەرد ، حەمە هەر جارێ ئەچێتە ناو بەرمیلێکەوە) .

(پەردە دائەدرێتەوە)

# پەردەی چوارەم

(دیمەنی دادگا . بارام و مەریوان ... مەریوان دەستێکی ئەماوە
کاوە و مەلا مەرزو باپیرو بایز لەگەڵ چەند کرێکارێکی کە لە
ناو تەلبەندان . ئاغاو فۆرمەن و حەمەشین و خاوەن ئیش و
گوڵزار لەناو هۆڵی دادگا لەگەڵ خەڵکەکەدان).

دادگەر- شایەتی شایەتەکان تەواو بوو .

نووسەر- شایەتی فۆرمەن و ئاغاو حەمەشین و خاوەن ئیش تەواو بوو .

دادگەر- شایەتی هەموویان ئێوە بە ئاژاوە و تێکدان تاوانبار ئەکا .

کاوە- جەنابی دادگەر ئێمە لە کەسمان نەداوە .

مەریوان- ئێمە لێت دراوین .

کاوە- مانمان گرت بۆ ئەوەی مافی خۆمان وەرگرین.. مان
گرتنیش شتێکی رەوایە .

دادگەر- بەپێی ئەمە تێکدان و ئاژاوە نانەوە و پڕوپاگەندەیە نەک مان گرتن

کاوە- ئەوان ئێمەیان دایە بەر گوللە !.

مەریوان- گەورەم ئەبێ ئێمە لە تەلبەندا بین یا خاوەن ئیش و
ئاغاو فۆرمەن و حەمەشین ؟ .

دادگەر- نەخێر ئێوە ... هەر ئێوە بوونا دەستدرێژیتان کردە
سەر ئاغاو خاوەن ئیش .

مەریوان- ئەی باشە ئەوان لە ئێمەیان دا یا خۆمان وامان لە خۆمان
کرد . فەرموو تەماشای دەم کەن بەجارێ براوەتەوە .

پیربال ـ خودا لە گوناهی سمکۆ خۆش بێ .. لوتفی سمکۆ بە گوللەی
ئاغاکان باشترین شایەتە کە ئەوان تاوانبارن .
بابیر ـ ڕاستە سمکۆ باشترین نموونەی مرۆڤایەتی بوو .
فەرامەرز ـ جەنابی دادگەر .. سمکۆ باشترین مرۆڤ بوو بۆ داواکردنی مافی
کرێکاران و ئێمە .. ئەو مرد بەڵام هەزارانی وەکو ئەو دێتە جێگای .
کاوە ـ جەنابی دادگەر .. جەنابی دادگەرە گشتی .. خوشک و برایان ...
سەرکەرانی دادگای بەڕێز ... ئەمە یەکەم شەهید نیە کە خۆی
لە پێناوی کرێکاران و هەژاراندا بەخت کرد ... ئەم کۆمیسیە لە
هەموو شوێنێک کە سەرمایەداری و چڵکاوخۆر لەوێ هەیە و
هەر واشی ئەبێ . هەروا بزانن کە کرێکاریش بۆ کەسی نابەزن .
هەروان و هەروا ئەبن . تکامان لە جەنابی دادگەری بەڕێزە
کە ئەم داواکاریەمان بە چاوێکی پاکەوە تەماشا بکا .. چونکە
ئێمە داوای مافی خۆمان ئەکەین .
دادگەر ـ ئێوە کردووتانە بە پەرۆشی خۆتان . لەخاوەن نیشتن و
ئاغاو خورمەتان داوە .
مەریوان ـ هەی ... هەی .. ئەمە بۆ جۆرێکی لە وەرگەڕا .
دادگەر ـ بارام حەمید کێیە ؟ ..
بارام ـ بەڵێ . من بارام حەمیدم .
دادگەر ـ شایەتی تەکامە لەهەموویان لەسەر تۆیە ! چونکە
تۆ هێزی ئاژاوە نانەوە بووی .
بارام ـ من لەوێ نە بووم .

کاوە - بەڵێ ڕاستە ئەوکا لەوێ نەبوو .

دادگەر - ئەگەر لەوێ نەبوو چۆنە هانی ئێوەی دا بۆیانی بوونی چەکدارانە .

مەریوان - ئەمجارە چەکی !... کەی ئێمە چەکدار بووین گەورەم .

حەمیشین - ( بە زمانی ئینگلیزی ) سایلەنت .

مەریوان - ئەمە کێ یە ؟! ئا ... کاسەلیسی ئینگلیزە ... قسەی ناکا بۆ خۆت ، لە سەر خۆت قسە بکە .

گوڵزار - دەم خۆش هەی شێرە ناو بێشە .

دادگەر - قسە مەکە ... من لەگەڵ تۆ نیم ... فێری قسە بە .

مەریوان - گەورەم کار لە قسەدا نەماوە ... چۆن ئێمە تاوانبار ئەکەی کە گوایە چەکدار بووین ؟ .

دادگەر - دووایی ! ؟ .

مەریوان - دووایی ... باشترین ڕۆژ ئەبێ بۆ کرێکاران .

دادگەر - ووس بە (لەگەڵ بارام) قسە بکە چۆن هانیانت دا کە چەک هەڵگرن ؟

بارام - جەنابی دادگەر ئەگەر من لەوێ نەبووم چۆن هانیانم دا کە چەک هەڵگرن ؟! ... من لە ئیش دەرکرا بووم ... پێش ئەم ڕووداوە بە ماوەیەک ئیشم نەبوو .

کاوە - بارام لەوێ نەبوو ... لە کاتی خۆیدا فۆرمەن بە دەرکردنی دا چونکە لە دادگا شکاتی لە خاوەن ئیش و فۆرمەن کرد بوو دەربارەی برایەکی کرێکارمان کە لە کاتی ئیشا مرد ... هۆی مردنیشی هەر ئەوانە بوون . ئەوانیش ئەمانەن ... تاوانبارن دەربارەی مردنی ئەو کرێکارە کە مەهدی یە .

دادگەر - تەماشاکە ... لەسەر خۆت ! ( بە تووڕەییەوە ) .
کاوە - تکایە تۆ دادگەری قسەی تۆ ئەبێ وەها بێ ؟ !
دادگەر - تەماشاکە ... تەماشا ئەمجارە لەگەڵ منا ! ... بزانە پێت ئەڵێم
تۆ قسە مەکە ... دووەم باسی شتی ڕابوردوو مەکە .
کاوە - ئەی قوربان ... خودا بەردەوامت کا . - چۆن باسی ڕابوردوو نەکەم
ئەمەیەکەم ڕووداوی ئەم باسەیە جەنابی دادگەر ، باعەرزت کەم
هەموو ڕووداوەکان وەک ئەڵقە وایە پێکەوە بەیەکەوە بەستراوە .
دادگەر - هەی هاوار . چۆن مان ناگرن ... ! ؟ چۆن بابی نابێ
هەر یەکە لەوانە ئەڵێی پارێزەرە .
کاوە - بەڵێ پارێزەرین .. وەختی گاڵتەوگەپ نییە .. بە ڕاستی گاڵتە کردن
بە کرێکار . کرێکار چاکە و خراپەی خۆی باش ئەزانێ چی یە
چینێک دژمنی و دۆستایەتی ، دوژمنی خۆی ئەناسێ ..
باش بزانە جەنابی دادگەر ، چینی کرێکار دژی سەرمایەدارییە
... هەروا لە پێناوی مافی خۆیدا ئەبێ بە پارێزەر .. هێزێکیش
هەیە کە لەسەری هەڵداتێ . ( نزە لەسەر لێوی برادەرەکانی ئەبینرێ ) .
دادگەر - زۆر زۆر باشە ... جوانە ... وەستا بارام دیارە باشتان
پەروەردە کردووە ؟ .
بارام - من پەروەردەیانم کردووە ؟ ! . نەخێر خۆیان خۆیان پەروەردە
کردووە . ... هەستیان بە ئێش و ئازاری هەموان ئەکەن و
ئەبنە مرۆڤێکی تێکۆشەر و دڵاوا . ئێوە بە پیاوی خراپ
ئەدەنە قەڵەم .

دادگەر - بەڵام هەموو شایەتەکانت تۆ تاوانبار ئەکەن .

بارام - (پێ ئەکەنێ) بە هەڵە داچووی جەنابی دادگەر ئەوانەی شایەتییان داوە بەسەرما ... خۆیان تاوانبارن ، ئەوان کرێکارەکانیان کوشت و لەناویان بردن ، تەماشاکە لەشی کرێکارەکان بکە بزانە چییان لێ هاتووە هەریەکە چەند برینی پێوەیە ؟ !... ئەی دادگەری بەرێز : ئەی داواکەری بەرێز : ئەمانە : گەورەکان ناودارەکان ، سەرمایەدارەکان وێنەی خۆرمەن و خاوەن مێشی و ئاغای بەرێز بەپەت منیان بەستەوە (٥٠٠) مەتر بە دووای ئۆتۆمۆبێلەکەوە ڕایان کێشام ئا ئەمە ... مرۆڤایەتییە ؟ ! .

دادگەر - هاه تۆ تە بە دەس خۆت خستە ناو تۆڕەکەوە ، ... ی بارام ئەفەندی تۆ زۆر باش لە مەسەلەکە ئەزانی بەڵام نینکاری ئەکەی . تۆ لەگەڵیانا بوویت و هەموو شتێکیان بۆ روون بووەوە .

بارام - بەڵێ من لەگەڵیانم جەنابی دادگەر . لەگەڵیانم بە مێشک و بیرو باوەڕ .. لێرەدا شتێکی شاراوە هەیە .. شتێکی جوان و نایاب ، ناوتری ، باسی ناکری ، وەکو داوی ئاوریشمە بەڵام بەهێزە .. هەرئەوەیە ئێمەی بەیەکەوە بەستووە .

دادگەر - ئەوە ئەبێ چی بێ ؟ ! .

بارام - شتێکی پیرۆزە باسی ناکرێ .

دادگەر - یەعنی من نازانم ! ؟ .

بارام - نەء جەنابی دادگەر تۆ نایزانی .. بەڵام ئەوان ئەیزانن چونکە لە منەوە نزیکن .

دادگەر - (بە نووسەر ئەڵێ) بنووسە: بارام هەمید دانی پێدا ناکە لەگەڵیانا بووە (بە بارام) باشە پێم بڵێ : تۆ بە دزییەوە ئەهاتی بۆلایان ؟ وانیە ؟ (بە نووسەر) بنووسە: بارام بە دزییەوە سەری لێیان ئەدا . باشە ئەی تۆ یەکێک نەبووی لە کرێکارەکانی گاوریاغی ؟ -. ئێستاشی پێم بڵێ چۆن بەڵگە بۆیان هێنا ...؟! .

بارام - (بە پێکەنینەوە) چەک ! -

دادگەر - بەڵێ چەک ئەو کاتەی کە مالتان گرت بە و چەکانەی کە لە یەکتان ئەدا پێم بڵێ کەس لەم لاو لەو لاوە یارمەتی ئەدای ؟ . گرنگترین شت ئەوەیە پێم بڵێی : لە کوێوە یە ؟ ! ... مەترسێ بە شەرەفم بە ناموسم هەمووتان بەرئەدەم . (کە ئەڵێ : بە شەرەفم بە ناموسم کرێکارەکان پێ ئەکەنن) .

سەریوان - جەنابی دادگەر چەکی چی ؟! چەک چەکی ئەوانە ئەوان ئێمەیان داپەرگەللە ... ئێمە هیچ بەدەستمانەوە نەبوو تەنها ئەو - دەرزا قیسانە نەبێ کە پێمانە .

ئاغا - وەڵڵەهی . وەبیللاهی . وەتەڵڵەهی . بەکاڵ ئەحمەدی شێخ ، ئەم لە برسا مردووە ئەگەر دەمی نەگری سەری یان ئەکەمەوە ، نەعلەت لە شەیتان .

گوڵزار ـ پەرستنی شوورەیی نیە... بەڵام دزی شوورەییە ، نۆکەری بۆ بێگانەو جەورکردن شوورەییە.. چڵکاو خواردنەوە شوورەییە .
ئاغا ـ سواڵکەری دێیە کەشی هاتە قسە .. من بۆتۆ ئەبێنم کچی سواڵکەر .
گوڵزار ـ بۆ پیاو شوورەییە ..لەمەوەشە !! .
داوالکاری گشتی ـ داوا ئەکەم لە دادگای بەرێز ئەم کچە لادێییە بێ دەنگ کا .
دادگەر ـ بێ دەنگ ئەبی یا دەرت کەم ؟ .
ئاغا ـ لێی گەرێ ، من ئەزانم چۆن تۆڵەی ئەسێنم .
مەریوان ـ بیبینیت لە بەر دەم خۆتا هەڕەشەی لێ ئەدا (قسە کە ئاراستەی داوالکاری گشتی ئەکا) .
دادگەر ـ تۆ قسە مەکە ئەو وەڵام ئەداتەوە .
مەریوان ـ کێ ؟ وەڵام ئەداتەوە .
دادگەر ـ وەڵام ئەداتەوە ... خۆی ئەزانێ کێ
مەریوان ـ من نازانم کێ وەڵام ئەداتەوە .
دادگەر ـ باڵام وەڵام ئەداتەوە .
مەریوان ـ پێت ئەڵێم ئەو لەوێ نەبوو ، بۆچی وەڵام بداتەوە ، سەیری ئەم سەیرەکەن ؟ ! .
دادگەر ـ دووای ؟ ! .
مەریوان ـ ئەو قسانە ئەکەی بۆ کێ ؟ .. لەگەڵ منا قسە بکە قوڵم شایەتە .
دادگەر ـ بێ دەنگ ئەبی یا بە جۆرێکی کە لە گەڵتا بجولێمەوە .
مەریوان ـ جۆرێکی کە ... جۆرێکی کەیشی هەیە ؟ ! .
دادگەر ـ بیبڕەوە ، بڕوا زۆرە (ئەبوبابام) دەی قسە بکە ئەڵێن

- وابانتان گرت هەندێ کرێکار دژی مانگرتنەکەتان بوون ...
لەوانە سمکۆ بوو .

مەریوان - تەواو تەواو ، بەزیادی خێرم نەکرد .

مۆزیەن - ( لە کاتێکدا ئەگری ) خوا لە گوناهت خۆش بێ سمکۆ .

مەریوان - ئەوە بۆچییە ئەگری ؟ تۆ ئەی حەقیقەتا روو ... ڕاستە
پێشینیان وتوویانە : پیاو ئەکوژرێ و شیوەنی بۆ ئەکا .

دادگەر - بەسەیەتی بیبڕەوە .

کاوە - ئەو لە پێناوی بیرو باوەڕێکا شەهید بوو .. ناوی پیس مەکەن ، هاوڕێی تۆ نەبوو .

دادگەر - باشە چۆنتان کوشت ؟ ،

کاوە - پێت ئەڵێم چۆن جەنابی دادگەر . لەوللەی ئەو ناپاکانە کوشتی ... ئێمە ئێستاو دووا ڕۆژیش ، داوای خوێنی ئەو هەژارە ئەکەین چونکە ئێمە هەرگیز ئەو بە هاوڕێیەکی دڵسۆزی خۆمان ئەزانین .

داواکاری گشتی - ئەوەم لە بەردەم دادگا هەڕەشە لە خەڵکی ئەدا .

کاوە - نەخێر داواکاری گەورە ، من هەڕەشە ناکەم ... من هەڕەشە تەنیا لە تاوانباران ئەکەم .. ئەوانە تاوانیان کردووە داوا لە دادگا ئەکەم بە توندی سزای ئەوان بدا نەک ئێمەی بێ تاوان .. چونکە ئێمە خاوەن مافین .

دادگەر - تۆ ئەڵێی چی بارام ؟ !

بارام - قسەم لەگەڵ قسەی کاوە دایە .

دادگەر - (بۆ مەریوان) تۆ !؟ .

مەریوان - منیش لەگەڵیانم ... خۆم لەوان زیاتریم .

دادگەر - (بۆ پیربال) ئەی تۆ ؟! .

پیربال - بەڵێ دەنگم لەگەڵ دەنگیانە بۆ داوای خوێنی سمکۆ وەهەدی .

بابیزو ملامەرز - بەڵێ ئێمەیش لەگەڵیا ئین .

دادگەر - پێنج دەقیقە دادگا هەڵئەستێ بۆ ئەوەی بڕیار دەرکا (دادگا لەگەڵ هەموو خەڵکەکە هەڵئەستێ تەنیا کرێکاران نەبێ) .

مەریوان - (روو ئەکاتە ئەملاوە) کوا ئەوانە کە لەخودا ناترسن ... ئەمەیە دادگەری ، یەکێکیان بە درێژی پای ئەکێشێ یەکێکیان بە پانی .

بارام - براگیان (دەستت چۆن بوو) ؟ .

مەریوان - وەڵڵا خۆ بەی تی . من دەس لە بیرو باوەڕم هەڵناگرم ئەگەر جارێ بمرم ئەگەر (٢٠) جاریش بمرم .

کاوە - داخ بۆ سمکۆ گیان . هیچ لە بیرم ناچیتەوە کە چەند پیاوێکی پاک دڵ و نەترس بوو .

بارام - سمکۆ بەڕاستی ئازا بوو .

کاوە - بەلای مەکینەکەوە وەستا بووم پارچە ئاسنێکم بە دەستەوە بوو ، ئاغا لە پێشەوە بۆم هات ، نەم زانی دەستی بۆ دەمانچەکەی برد ، ویستی تەقەم لێ بکا ، تەقەیشی کرد

- زەلامێك وێستی بچیاڕێژی .. لام كردەوە تەماشام كرد سمكۆ
كەوتە لاو خوێنی لە پێناوی مندا بەخت كرد . سەرێكی كردم ،
زەردەخەنەیەك گرتی پێی ووتم : دەستی لەماڤمان هەڵ
مەگرن ... دوا هەناسەی بە یەزدان سپارد و مرد .

بارام - نا .. نا ئەو نەمرد ووەو نامرێ .. هەرگیز نەمرە ...
جارێكی لێبینیم لەسەر مرۆڤ خوێندەوە كە ئەدوای پڕیاری
دوا ڕۆژی مرۆڤی ئەكردە دوو بەشەوە . بەشێكی باسی مرۆڤی
سەرووشتی ئەكرد ، ئەو بەشەكەیشی باسی مرۆڤی نەمری
ئەكرد . هەروا زانیم مرۆڤی ئاسایی تا ڕۆژی خۆی ئەژی ..
بەڵام كە ئەمرێ ناوی نامێنێ .. مردنی مێژوویی ئەبێ و
كەسەیەكە ئەمرێ دوا ڕۆژی لەبەرلە ئەداتەوە خۆی
لە پێناوی ئەو ڕۆژەدا بەخت ئەكا ... دوا ڕۆژ مژدە بە
هەموو مرۆڤێك ئەدا .. ئەو نەمرە هەرگیز لە یاد ناچێتەوە
... ئەوەیش بزانن كە سمكۆی برامان یەكێك بوو لەم جۆرە
مرۆڤانە سمكۆیش خۆی لە پێناوی كرێكارانا بەخت كرد .

مەرلین - ئای چینم لە پاسەوانەكەی ئاغایە .. بە خەنجەر قۆڵی بڕیم .

( دادگا دائەنیشێتەوە )

نووسەر - دادگا .

گوڵزار - مەرلین لە مەرگ ناترسی ؟ ئای ئامۆزا گیان چۆن هێشتت
ئەم چەڵقاو خۆرانە بتهێننە ئێرانە ؟! .

مەرلین - چی بكەم گوڵزار گیان ، چار نەبوو چەكم هەبوایە ئاگریانم ئەدا .

داواکاری گشتی - گەورەم ئەمەوێ ئەم کچە لادێیە دەرکەنە دەرەوە.

دادگەر - زۆر ڕاستە دەری کەنە دەرەوە.

گوڵنزار - دەرم مەکەن، ئەمەوێ ئامۆزاکەم ببینم بزانم چۆن دژی ئێوەی بەکرێ گیراو قسە ئەکا (پۆلیس دەری ئەکاتە دەرەوە) لە ناو هۆڵی دادگا ئەڵێ: مەریوان لە مردن ناترسێ وهەتا هەتایە نابەزێ.

دادگەر - ئێستەش ئەوە بڕیاری دادگا بخوێنمەوە، ئامۆژگاریەک هەیە بۆ چینی کرێکار پێویستە... ئێستا کە کرێکاران ئەرکی سەر شانیانە ئەوەیە کە بەرهەم زیاد کەن لە ئێوەی وڵاتەکەتان گەشە بسەنێ، نەک وەک ئەم کردەوانە کە ئەیکەن.

بارام - بەڵێ ئەتانەوێ داڕێکی بێ بەلێ ئاو و خزمەت بۆتان بێنینە بەر. ئەو دارەشی بەرامبەر بە هەموو ناخۆشیەک ڕاوەستێ وکرم بیکۆڵێ و سارد و سەرما ووشکی بکا... لە دووایی دا چاوەڕوانی بەر و بومی بکەن.

دادگەر - بەسیەتی وتم مەپرسە؟.

بارام - چونای دادگەر.. ئەو شتە چیە؟ کە کرێکار دەمی ئەکەرێ بەرامبەر هەموو ئەرک و ماندووبوونی ئەو ئەرکەیە کە بەرهەم زیاد ئەکا، چۆن بەرهەم زیاد کا ئەگەر ئێوە و گەورەکانە وا بە کرێکار بکەن.

دادگەر - گوێم ئەگەر کرێکار لە خۆشیدا بێ، وڵات لە خۆشیدایە.

بارام - چۆن؟!.

دادگەر - بەسیەتی.. ئێوە ئامۆژگاری وەرناگرن (بڕیاری دادگا)

ـ دادگا بڕیاری بەناونیار کردنی ئەم کۆمکارانەدا ، ئەمیش بە
بەندکردنیان ، لەم سەرەوە تاکو ئەوکورە ڕانکۆحۆغەسییە
٤ ساڵ .. لەو بەولاوە ٦ ساڵ لەگەڵ ئیشی قورس وگرانا .
ڕانکۆحۆغەسیکە ـ ئەی من ؟ .
دادگەر ـ بڕۆ تۆیش ٥ ساڵ «دادگا هەڵسا»
بارام ـ بابڕوخێ پاشایەتی وئیمپریالیزم وکۆنەپەرستان .
هەموان ـ بڕوخێ ... بڕوخێ ... بڕوخێ .
بارام ـ بۆ دوژمنی ناڵەبار نابینە داری بەردار .
هەموان ـ بۆ دوژمنی ناڵەبار نابینە داری بەردار .
بارام ـ بابڕوخێ حوکمی شایەتی بۆگەن .
هەموان ـ بڕوخێ ... بڕوخێ ... بڕوخێ .
دادگەر ـ دەریانکەنە دەرەوە .

«پەردە دائەدرێتەوە»

کۆتایی

## چاوەڕوانی مێژووی عەشیرەتی زەنگنە بن بەم زووانە ئەکەوێتە ژێر چاپەوە .

سوپاس

۱- بۆ خۆشنووسی هاوڕێم عەبدولڕەحمان دەروێش
بە حەفەرکە عەمرو شانۆگەریکەی نووسیەوە .
۲- بۆ مامۆستا فایق حەسەن کە وێنەی بەرگی دامێ .

## نووسەر لە چەند دێڕێکدا

- محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگنە .
- لە ساڵی ١٩٤٠ ز لە شاری کەرکوک لە دایك بووە .
- لە ساڵی ١٩٧١ وە دەستی داوەتە نووسین .
- گەلێ وتار و نوسینی لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردیەکاندا بڵاوکردووەتەوە .
- فەرمانبەرە ... خاوەنی چوار منداڵە .

لە نووسینەکانی :

١ ـ گاوڕباخی ... شانۆگەریە .

٢ ـ سەمای مەرگ ... کۆمەڵە چیرۆکە بۆ منداڵان .

٣ ـ هەستی دایك ... کۆمەڵە چیرۆك .

٤ ـ مێژووی زەنگنە ... لێکۆڵینەوەیێکە لە مێژووی عەشیرەتی زەنگنە لەگەڵ کۆکردنەوەی بەرهەمی گەورە پیاوان و شاعیرانی ئەم عەشیرەتە .

مسرحية

# الاضراب

محمد عبد الرحمن زه نگنه

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ٥٩٤ سنة ١٩٧٩
طبعت في مطبعة علاء - بغداد
سعر النسخة ٤٠٠ فلساً
طبعة ثانية